تیوەندی Aram

فێر بوون و بەکارهێنانی



# میدیا ستۆدیۆی 8 هەنگاو بەهەنگاو

لەسەرەتاوە تاکۆتایی بەرنامەکە بەهەموو نهێنیەکانیەوەبەبێ ئاڵۆزی







لەگەڵ ئەم کتێبەدا سیدیەکی بەرنامەکە بەدیاری وەربگرە

ئامادەکار
ئیکرام هادی




# Ulead Media Studio Pro 8

# میدیا ستودیۆی 8

# هەنگاو بە هەنگاو

نووسین و ئامادەکردنی: إکرام هادی





## چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم کتێبە

لەم کتێبەدا ئێمە بابەت لەدوای بابەت باسی پرۆگرامی میدیا ستودیۆمان کردووە. تۆ ئەتوانیت ئەم کتێبە وەك فەرهەنگێك بەکاربێنیت، هەر کاتێك بابەتێکت هاتە ڕێ و ویستت زیاتری لەسەر بزانیت یان پێویستت بە ڕێ پیشاندان بوو بابەتی دیاریکراو لە کتێبەکەدا بکەرەوە و چاوێك بە هەنگاوەکان و وێنە سادەکاندا بخشێنە و دووبارەی ڕێگەکەت بدۆزەرەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر تۆ سەرەتای کارکردنتە لە میدیاستودیۆدا، ئەتوانیت ئەم کتێبە وەك "دەورە" یان کۆرسێك بەکاربێنیت، کۆمپیوتەرەکەت دابگیرسێنە و هەر لە بابەتی یەکەمەوە دەست بکە بە خوێندنەوە و ئەنجامدانی هەنگاوەکان بە دەستی خۆت. دڵنیابە دوای چەند ڕۆژێك (مەبەستمان ئەوەیە هەر ڕۆژەی یەك دوو سەعاتێك، نەك بەیانی تا ئێوارە!) شارەزابیت لە میدیاستودیۆدا دەگاتەوە بە زۆرێك لەو کەسانەی خۆیان بە پسپۆر دەزانن لە میدیاستودیۆدا.

اکرام هادی

سێ و نیوی شەوی 12 لەسەر 13 ی سێپتەمبەری 2007

ikramkurdi@Gmail.com






# بەشی یەکەم




# دابەزاندن

پێش هەموو شتێك، بۆ ئەوەی دەست بکەیت بە کارکردن لە میدیاستودیۆدا، پێویستە پرۆگرامەکەت لە کۆمپیوتەرەکەدا هەبێت. هەنگاوەکانی خوارەوە باسی چۆنێتی دابەزاندنی پرۆگرامی میدیاستودیۆ ئەکەن لەسەر کۆمپیوتەرکەت:

1. CD یان DVD پرۆگرامەکە بخەرەوە ناو درایڤەکەیەوە.

2. لە لیستی Start دا کلیك لەسەر My Computer بکە. ویندۆی My Computer دەکرێتەوە.



3. دەبڵ کلیك لەسەر ئایکۆنی درایڤەکە بکە، بۆ نموونە درایڤی :H.




4. دەبڵ کلیك لەسەر فۆڵدەری Ulead MediaStudio Pro 8.0 بکە. (ئەگەر CD یان DVD ەکی جیاواز بەکاربێنیت ئەکرێت ئەم هەنگاوە جیاواز بێت).



5. دەبڵ کلیك لەسەر فایلی Setup.exe بکە.

6. چاوەڕێ بکە تا پرۆگرامی دابەزاندنەکە دەکرێتەوە.



7. دوای کرانەوەی پرۆگرامەکە، لێرەدا کلیك لەسەر Next بکە.




8. کلیك لەسەر Yes بکە.



9. لێرەدا ئەتوانیت شوێنی دابەزاندنی پرۆگرامەکە لەسەر کۆمپیوتەرکەت بگۆڕیت، شوێنی ئاسایی دابەزاندنی پرۆگرام لە زۆربەی کۆمپیوتەراندا بریتییە لە C:\Program Files. ئەگەر ئەتەوێت شوێنێکی دیکە هەڵبژێریت، کلیك لەسەر Browse بکە و شوێنەکە دیاری بکە. دایەلۆگ بۆکسی Choose Folder دەکرێتەوە. ئەگەر شارەزاییت لە شوێنی دابەزاندنی پرۆگرام نییە هەنگاوی (9) و (10) بپەڕێنە.




10. دوای دیاریکردنی شوێنەکە کلیك لەسەر OK بکە.



11. کلیك لەسەر Next بکە.




12. لێرەدا ئەتوانیت ئەو درایڤە بگۆڕیت لەسەر کۆمپیوتەرکەت کە پرۆگرامی میدیاستودیۆ بەکاری دەهێنێت بۆ کارکردن تیایدا. بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پرۆگرامەکە ئەو درایڤە هەڵدەبژێرێت کە زیاترین شوێنی بەتاڵی تیا بێت، بۆ ئەوەی کارکردنی باشتربێت. بۆیە چاکتر وایە گۆڕانکاری لێرەدا نەکەیت. بۆ هەڵبژاردنی شوێنێکی تر کلیك لەسەر Browse بکە.




13. دوای هەڵبژاردنی شوێنەکە، کلیك لەسەر Next بکە.



14. لێرەدا ستانداری ڤیدیۆکەت دیاری دەکەین کە بەپێی وولاّت دەگۆڕێت. کلیك لەسەر ئەم هەڵبژاردنە بکە.




15. کلیك لەسەر ئەم هەڵبژاردنە بکە، کە لە عێراقدا بەکاردێت.



16. کلیك لەسەر Next بکە.




17. کلیك لەسەر Install بکە بۆ دەستکردن بە پرۆسەی گواستنەوەی پرۆگرامەکە بۆ ناو کۆمپیوتەرکەت.







18. چاوەڕێ بکە تا پرۆسەی دابەزاندنەکە تەواو دەبێت.






19. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Finish بکە.



## کراک کردنی میدیا ستودیۆ

بۆ خستنەکاری میدیا ستودیۆ پرۆسەیەك ماوە، ئەویش بریتییە لە کراك. پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر، بۆ نموونە میدیاستودیۆ، لەلایەن کۆمپانیایەکی دیاری کراوەوە بلاو دەکرێنەوە و پێویستە پرۆگرامە هەر لە ئەو کۆمپانیایە بکڕیت، نەوەك لە کەسێکی تر کە CD پرۆگرامەکەی دەستکەوتبێت و کۆپی بکات. لە وولاتە گەشەسەندووەکانی وەکو ئەمریکا و ڕۆژئاوای ئەوروپا، دابەزاندنی پرۆگرامێك لەسەر کۆمپیوتەرکەت کە لە کۆمپانیای سەرەکی نەت کڕیبێت بەڵکو لە کەسێکت کڕیبێت کە پرۆگرامەکە لەسەر CD کۆپی بکات و بلاوی بکاتەوە، کارێکی نایاساییە. چونکە ئەو کۆمپانیای کە ماندوو بووە لەگەڵ بەرهەمهێنانی پرۆگرامەکەدا هیچ قازانج لەوە ناکات کە تۆ پرۆگرامەکە لە کەسێکی تر بکڕیت.

بەڵام لە وولاتە دواکەوتووەکانی ئاسیا و ئەفریقادا کە یاسا تیایاندا بەرقەرار نییە، هیچ کەس ئامادە نییە پارەیەکی زۆر بدات بە نوسخەیەکی ئەسڵی پرۆگرامێك، بەڵکو هەر کۆپییەکی لەبەر دەگرنەوە. جا بۆ ئەوەی ئەم کۆپیانە کار بکەن، پێویست بە پرۆگرامێکی (نایاسایی) دی دەبێت، بەم پرۆگرامە دەوترێت کراك، کە گۆڕانکاری لە کۆمپیوتەر و پرۆگرامەکەدا ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی بکەوێتە کار.

### بۆ کراك کردنی میدیا ستودیۆ:

1. لە CD یان DVD میدیاستودیۆدا دەبڵ کلیك لەسەر Crack.exe بکە.



2. کلیك لەسەر Install بکە.

3. ویندۆکە دادەخرێت و دایەلۆگ بۆکسی Registry Editor دەکرێتەوە. کلیك لەسەر Yes بکە.



4. کلیك لەسەر OK بکە.






## پێکهاتەکانی میدیا ستودیۆ

میدیا ستودیۆی 8 لە سێ پرۆگرام پێکهاتووە:

1. Video Editor بۆ مۆنتاژی ڤیدیۆ.
2. Audio Editor بۆ مۆنتاژی دەنگ.
3. Video Capture بۆ تۆمارکردنی ڤیدیۆ.




بەشی یەکەم دیمەنی Video Editor ت پێ دەناسێنێت لەڕێگەی گەشتێک بەنێو پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی ناوچەی کارکردن کە پێ دەوترێت وێرکسپەیس (workspace) ی پرۆگرامەکە، لەگەڵ چەند ڕێگەیەك بۆ ڕێکخستن و خەزنکردنی وێرکسپەیس. هەروەها فێری چۆنێتی تۆمارکردنی ڤیدیۆ دەبێت ڕاستەوخۆ لەڕێگەی Video Editor ەوە، لەگەڵ بەڕێوەبردنی فایلەکانت لەڕێگەی Production Library و بەکارهێنانی هەندێك لە فەرمانە بنچینەییەکانی پرۆگرامەکە.

ئەگەر ئەتەوێت بە پەلە دەست بکەیت بە کارکردن لەسەر ڤیدیۆ، ئەتوانیت زۆربەی ئەم بەشە بپەڕێنیت، بەڵام زانینی بابەتەکانی ئەم بەشە گرنگە ئەگەر ئەتەوێت ببیت بە بەکارهێنەرێکی شارەزای میدیا ستودیۆ.

## تێگەشتن لە وێرکسپەیسەکە

ویندۆی تایملاین (Timeline Window) ئەو شوێنەیە کە پرۆژەکەتی تێدا پێکەوە دەنێیت و دەستکاری دەکەیت. بەشێوەیەکی ئاسۆیی دانراوە و لە ژمارەیەك چینی سەربەخۆ یاخود تراك (tracks) پێکهاتووە. ئەم تراکانە ئەو کلیپانە لەخۆدەگرن کە پرۆژە ڤیدیۆییەکە دروست دەکەن. ویندۆکانی تر لەناو وێرکسپەیسی Video Editor دا، وەکو ویندۆی تاقیکردنەوە (Preview Window) و بەڕێوبەری کاریگەرییەکان (Effects Manager) دانراون بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەن لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی ڤیدیۆکەتدا.




1. تووڵباری Standard.
2. Panel Manager.
3. Effects Manager.
4. Production Library و Project Tray.
5. ویندۆی Source و ویندۆی Preview.
6. تووڵباری Timeline.
7. ویندۆی Timeline.
8. دوگمەکانی تراك: لۆك، شاردنەوە، لەگەڵ دوگمەکانی Solo.
9. کلیپی ڤیدیۆی ناو تراکی ڤیدیۆ.
10. کلیپی کاریگەریی گۆڕانەکان.
11. کلیپی دەنگی ناو تراکی دەنگ.



## تووڵباری Standard

دروستکردنی پرۆژەیەکی نوێ

کردنەوەی فایلی پرۆژەیەك

خەزنکردنی پرۆژەکە

دروستکردنی فایلێکی ڤیدیۆیی

پیشاندان و دەستکاریکردنی سیفاتی پرۆژەکە

قرتاندنی کلیپێك لە پرۆژەکە.

کۆپیکردنی کلیپێك لە پرۆژەکە.

دانانی کلیپێکی قرتێنراو یان کۆپیکراو لەناو Timeline دا.

یارمەتی

کردنەوەی ماڵپەڕی Ulead

دۆزینەوەی کلیپی داهاتوو

دۆزینەوەی کلیپێك لە پرۆژەکەدا

دووبارە ئەنجامدانی کردارێك کە پێشتر لێی پەشیمان بوبیتەوە

پەشیمان بوونەوە لە کردارێکی ئەنجامدراو

## Panel Manager

Panel Manager ڕێگەت پێ ئەدات ویندۆ جیاکانی ناو وێرکسپەیس پیشان بدەیت یان بشاریتەوە. ئەتوانیت لە تەنیشت یان ژێر تووڵباری Standard دا دایبنێیت، یاخود لە هەرشوێنێکدا لەناو وێرکسپەیسدا بە سەربەخۆیی دایبنێیت.



# تووڵبارى Timeline



## ڕێکخستنی وێرکسپەیس

ویندۆ جیاکانی ناو پرۆگرامی Video Editor ئەکرێت بەسەربەخۆ "بفڕن" یاخود بلکێنرێن بە بەشێکی پرۆگرامەکەوە. بۆ لکاندنی تووڵبارێك، کلیك لەسەر تایتڵباری تووڵبارەکە بکە پاشان ڕای بکێشە بۆ قەراخی ویندۆیەکی دیکە یاخود قەراخی وێرکسپەیسەکە.

1. تووڵباری Standard بە لکێنراوی.




2. تووڵباری Standard لە حاڵەتی فڕین دا.



## خەزنکردنی دیمەنی وێرکسپەیس

لە لیستی Window دا Layout Manager بەکاربێنە بۆ ئەوەی دیمەنی وێرکسپەیسەکە خەزن بکەیت، بۆ ئەوەی هەموو جارێك پێویست نەکات ویندۆکان ڕێکبخەیتەوە.

### بۆ خەزن کردنی دیمەنی وێرکسپەیس:

1. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Layout Manager بکە. دایەلۆگ بۆکسی Layout Manager دەکرێتەوە.




2. کلیك لەسەر New بکە. دایەلۆگ بۆکسی New Layout Template دەکرێتەوە.



3. لە لاکێشەی New template name دا ناوێك بۆ دیمەنەکە بنووسە.
4. کلیك لەسەر OK بکە.




5. کلیك لەسەر Close بکە بۆ داخستنی دایەلۆگ بۆکسی Layout Manager.



## خستنەکاری دیمەنێک

دوای خەزنکردنی دیمەنەکە، ئەگەر گۆڕانکاریت ئەنجامدا لە دیمەنی وێرکسپەیسدا و پاشان ویستت دیمەنەکە بگەڕێنیتەوە بۆ باری پێشتر کە خەزنت کردبوو، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە. سوودی خەزن کردنی دیمەن و دووبارە بەکارهێنانەوەی ئەوەیە کە ئەتوانیت دیمەنی جیا بۆ ئیشی جیا بەکاربێنیت، وەك دیمەنێك بۆ کارکردن لەسەر ڤیدیۆ، دیمەنێکی تر بۆ کارکردن لەسەر دەنگ، هتد.

1. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Layout Manager بکە.
2. لە لیستی Existing layout templates دا دیمەنێك هەڵبژێرە بە کلیك کردن لەسەری.
3. کلیك لەسەر Apply بکە.




Layout Manager
Existing layout templates:
Dock at Bottom
Dock on Top
Standard (1024x768)
Standard (1280x1024)
View1
Window_floating
New...
Edit...
Preview
Delete
Save To
Reset
Apply
Close
2


Layout Manager
Existing layout templates:
Dock at Bottom
Dock on Top
Standard (1024x768)
Standard (1280x1024)
View1
Window_floating
New...
Edit...
Preview
Delete
Save To
Reset
Apply
Close
3

## دامەزراندنی پرۆژەیەکی ڤیدیۆ

لە ڤیدیۆ ئێدیتەر (Video Editor) دا (پرۆگرامی سەرەکیی میدیا ستودیۆ)، Timeline و کلیپەکانی ناوی پێیان دەوترێت پرۆژەیەکی ڤیدیۆ، کە وەکو فایلێکی DVP (Digital Video Project) خەزن دەکرێت. کاتێک کە پرۆژەیەکی ڤیدیۆ خەزن دەکەیت، ڤیدیۆ ئێدیتەر تەنها شوێن و سیفاتی کلیپەکانی ناو Timeline خەزن دەکات، بەڵام دووبارە کلیپە ڤیدیۆییەکان خەزن ناکاتەوە. سوودی ئەمەش ئەوەیە کە فایلێکی DVP قەبارەیەکی بچووکی هەیە و هەموو دەستکاریکردنێک کە لەسەر فایلە ڤیدیۆییەکان ئەنجام دەدرێت کاریگەرییان لەسەر فایلە ئەسڵییەکان نییە.

بۆ دەستکردن بە کار لە ڤیدیۆ ئێدیتەر دا سەرەتا پێویستە پرۆژەیەکی ڤیدیۆ دروست بکەیت. ئەم پرۆژەی ڤیدیۆ لەگەڵ لەخۆگرتنی ئەو کلیپانەی کە تۆ لە Timeline دا دایان دەنێیت سیفاتی ڤیدیۆی کۆتاییش دیاری دەکات، وەکو قەبارەی وێنەی ڤیدیۆکە جۆری ئەو سیستمی تەلەفزیۆنەی کە تۆ ڤیدیۆکەی بۆ دروست دەکەیت. هەر کلیپێک کە تۆ ئەیخەیتە ناو پرۆژەکەوە ئەم سیفاتانەی بەسەردا دەسەپێنرێت.

## بۆ دروستکردنی پرۆژەیەکی نوێ:

1. کلیك لەسەر دوگمەی New بکە لەسەر تووڵباری Standard یاخود لە لیستی File دا کلیك لەسەر New بکە. یان Ctrl + N بکە. دایەلۆگ بۆکسی New دەکرێتەوە کە لیستێك لە پرۆژەی ئامادەکراوی تێدایە.




2. فۆرماتی ڤیدیۆکەت دیاری بکە (AVI یان MPEG) لە لیستی Edit file format دا.




3. کلیك لەسەر ئەو پرۆژە ئامادەکراوە بکە کە ئەتەوێت بەکاری بێنیت. (سیفاتەکانی پرۆژەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی لە لای ڕاستی دایەلۆگ بۆکسەکەدا دەردەکەوێت). ئەتوانێت یەکێك لەم پرۆژانە هەڵبژێرێت:

- DV: بۆ دەستکاریکردن و بەرهەمهێنانی DV ی ستاندارد (ڤیدیۆی ئاسایی لە کامێرای ڤیدیۆی دیجیتاڵییەوە).
- DV 16:9: بۆ دەستکاریکردن و بەرهەمهێنانی DV ی widescreen.
- DV 24P: بۆ دەستکاریکردنی ڤیدیۆ لە کامێرایەکی Panasonic AG-DVX100 کە بە شێوەی 24P یان 24PA تۆمارکرابێت.
- DVD-Dolby Digital 5.1 channel: بۆ دەستکاریکردن و بەرهەمهێنانی DVD بە فۆرماتی دەنگی Dolby Digital 5.1 surround sound.
- HDV templates: بۆ دەستکاریکردن و بەرهەمهێنانی ڤیدیۆ لەجۆری HDV و HD.
- هتد...

4. کلیك لەسەر OK بکە. دایەلۆگ بۆکسەکە دادەخرێت و پرۆژەیەکی نوێ دروست دەکرێت.


New
Edit file format:
Microsoft AVI files
Existing project templates:
Previous Settings
DV (NTSC, 29.97fps, Audio 48kHz)
DV (PAL, 25fps, Audio 48kHz)
DV 16:9 (NTSC, 29.97fps, Audio 48kHz)
DV 16:9 (PAL, 25fps, Audio 48kHz)
Presentation Video (30fps, Indeo)
Presentation Video (25fps, Indeo)
CD-ROM Video (30fps, Cinepak)
CD-ROM Video (25fps, Cinepak)
On-line Video (NTSC, 29.97fps)
On-line Video (PAL, 25fps)
NTSC DV 24P (23.976 fps, 32KHz)
NTSC DV 24P (23.976 fps, 48KHz)
Properties
NTSC drop frame (29.97 fps)
Microsoft AVI files
24 bits, 720 x 480, 4:3, 29.97 fps
Lower Field First
DV Video Encoder -- type 1
PCM, 48.000 kHz, 16 Bit, Stereo
Description:
Use this template when doing on-line editing for NTSC type-1 DV video tape.
Always show this dialog box
Delete
Rename...
Create...
OK
Cancel
3
4

## دروستکردنی پرۆژەی ئامادەکراو

کتێت کە پرۆژەیەکی نوێ دەست پێ دەکەیت، لەوانەیە هیچ کام لە پرۆژە ئامادەکراوەکان بەپێی ویستی تۆ بێت لەم حاڵەتەدا پێویستە خۆت هەڵبژاردنەکان دیاری بکەیت بۆ دروستکردنی پرۆژەیەکی ئامادەکراوی نوێ کە -واتر ئەتوانیت بەکاری بێنیتەوە بۆ ئەوەی پێویستییەکانی تۆ جێبەجێ بکات.

### بۆ دروستکردنی پرۆژەیەکی ئامادەکراو:

1. لە دایەلۆگ بۆکسی New دا کلیك لەسەر دوگمەی Create بکە. دایەلۆگ بۆکسی Template Options دەکرێتەوە.




2. سیفاتی پرۆژە ئامادەکراوەکەت دیاری بکە. (لە لاپەرەکانی داهاتوودا باسی ئەم سیفاتانە دەکەین).
3. کلیك لەسەر OK بکە. دایەلۆگ بۆکسی Save New Template دەکرێتەوە.




4. ئیشارەت لە بۆکسی Save the current settings بدە.



5 ناوێك لەگەڵ ڕوونكردنەوەيەك بۆ پڕۆژە ئامادەكراوەكەت بنووسە.

6 كليك لەسەر OK بكە.

ـيستا پڕۆژە ڤيديۆييەكەت ئەو سيفاتانەى دەبێت كە دياريت كردوون و جارى داهاتووش كە پڕۆژەيەكى نوێ ـحكميتەوە. پڕۆژە ئامادەكراوەكەت لە دايەلۆگ بۆكسى New دا دەردەكەوێت بۆ ئەوەى بتوانيت هەڵى بژێريت.



## کردنەوەی پرۆژەیەکی خەزن کراو

بۆ کردنەوەی پرۆژەیەکی خەزن کراو لەسەر هارددیسکەکەت یاخود شوێنێکی تر:

1. لە لیستی File دا Open هەڵبژێرە یاخود کلیك لەسەر ئایکۆنی Open بکە لە تووڵباری Standard دا.



2- دایەلۆگ بۆکسی Open دەکرێتەوە. لێرەدا شوێنی پرۆژەکەت بدۆزەرەوە و کلیکی لەسەر بکە.

3- کلیك لەسەر Open بکە.



## ڕێکخستنی پڕۆژەیەکی ڤیدیۆ

کاتێك کە پڕۆژەیەکی نوێ دروست ئەکەیت، هەموو سیفاتەکانی پڕۆژەکە هەڵبژاردنەکانی ناو دایەلۆگ بۆکسی New دیاری دەکات. ئەم هەڵبژاردنانە بنچینەیین بۆ پڕۆژەکەت و ئەمانە دیاری دەکەن ڤیدێوی کۆتایی چۆن دەردەچێت. ئەتوانیت گۆڕانکاری لەم ڕێکخستنانەدا ئەنجام بدەیت و پڕۆژەکەت لە ڕێگەی دایەلۆگ بۆکسی Project Settings ەوە ڕێك بخەیت.

بۆ پیشاندان و دەستکاریکردنی هەڵبژاردنەکانی پڕۆژەکەت کاتێك کە لە پڕۆژەکەدایت:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Project Settings بکە لە تووڵباڕی Standard دا، یاخود لە لیستی Project دا کلیك لەسەر Project Settings بکە. یان Alt + Enter بکە. دایەلۆگ بۆکسی Project Settings دەکرێتەوە.

2. بۆ گۆڕینی هەریەکێك لە هەڵبژاردنەکان، کلیك لەسەر دوگمەی Edit بکە بۆ کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسی Project Options. کلیك بکە بەناو تابەکاندا و سیفاتەکان دیاری بکە. (بابەتی داهاتوو بە درێژی باسی هەڵبژاردنەکان دەکات).



## دایەلۆگ بۆکسی Project Options

وەک پێشتر باسمان کرد، دایەلۆگ بۆکسی Project Options کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆت پێ دەدات بەسەر پرۆژەکەتدا (بۆ چۆنێتی کردنەوەی ئەم دایەلۆگ بۆکسە بابەتی پێشوو بخوێنەوە). لەم دایەلۆگ بۆکسەدا سێ تاب هەن:

### تابی Video Editor

1. ستانداردی تەلەفزیۆنەکەت دیاری بکە. NTSC لەم ئەمریکادا بەزۆری بەکاردێت. PAL لە عێراقدا و وولآتانی دی.
2. ئیشارەت لێرە بدە ئەگەر ئەتەوێت ئەو فیلتەرانەی کە لە پرۆژەکەتدا دایان دەنێیت پیشان بدرێن لەکاتی پیشاندانی پرۆژەکەت لە ڤیدیۆ ئێدیتەردا.
3. جۆری کەناڵی دەنگەکە دیاری بکە، ستیریۆ بێت (Stereo) یان مەڵتی چانێل ( Multi Channel Surround Sound واتە کەناڵی دەنگەکانی لە ستیریۆ زیاتر بێت. ستیریۆ دوو کەناڵی هەیە، چەپ و ڕاست (L و R).



## تابی General

1. لێرەدا جۆری پرۆژەکەت دیاری بکە، دەنگ و ڕەنگ (Audio and Video) بێت، یان تەنها ڕەنگ (Video)، یان تەنها دەنگ (Audio).
2. لێرەدا ژمارەی فرەیم (Frame) ەکان هەڵبژێرە لە چرکەیەکدا. فایلی ڤیدیۆ لە چەندین وێنەی وەستاو پێکهاتووە کە کاتێك بە خێرایی پێکەوە پیشان دەدرێن بە جووڵاو دەردەکەون، هەروەك فیلمی سینەما. بە هەر یەکێك لە وێنە وەستاوەکان دەوترێت فرەیم. فایلێکی ڤیدیۆ تا ژمارەی فرەیمەکانی لە چرکەیەکدا زیاتر بێت ئەوا ڤیدیۆکە ڕوونتر و جوانتر دەردەکەوێت. ئەگەر ڤیدیۆکەت بە PAL تۆمار کردبێت پێویستە 25 هەڵبژێریت، ئەگەر بتەوێت فایلەکە بچووکتر دەربچێت ئەتوانیت ژمارەیەکی بچووکتر هەڵبژێریت، بەڵام ڤیدیۆکەت جوانییەکەی لەدەست دەدات.
3. Frametype جۆری پێکەوە بەستنی فرەیمەکان دیاری دەکات. هەڵبژاردنی Frame-based کێشەی کەمترە و بەکارهێنانی ئاسانترە.
4. لێرەدا ئەتوانیت ڕووبەری شاشەی ڤیدیۆکە دیاری بکەیت.
5. هەڵبژاردنی 4:3 بۆ تەلەفزیۆنی ئاسایی، شاشەی کۆمپیوتەر، لەگەڵ هەندێك کامێرای ڤیدیۆی دیجیتاڵی دەبێت. هەڵبژاردنی 16:9 بۆ تەلەفزیۆن یان شاشەی کۆمپیوتەری widescreen دەبێت، لەگەڵ HDTV، سینەما و هەندێك کامێرای ڤیدیۆی دیجیتاڵی. ئەگەر 16:9 ت هەڵبژارد پێویستە لە تابی General دا ئیشارەت لە بۆکسی **Perform non-square pixel** rendering بدەیت.



## بی AVI / Compression

تابە هەموو کۆنترۆڵەکانی کەپس کردنی ڤیدیۆ و دەنگی تێدایە. شتێك کە پێویستە لە بیرت بێت لەکاتی کردن لەگەڵ کەپس کردندا قەبارەی فایلی کۆتاییە. بۆ ئەوەی فایلی کۆتایی بچوك دەربچێت، ڤیدیۆکەت بە ترین و نوێ ترین ڕێگەی کەپسکردن کەپس بکە. پێویستە ئەوە بزانیت کە هەتا ڕادەی کەپس کردنەکە زیاتر . فایلی کۆتایی بچووکتر دەردەچێت و ڤیدیۆکە ناڕوونتر یان ناشرین دەبێت. جۆرە جیاوازەکانی کەپس تاقی بکەرەوە بۆ دۆزینەوەی شێوازێك کە بۆ پێویستییەکانت بگونجێت.



## خەزنکردنی سیفاتەکانی پرۆژەکە وەکو پرۆژەیەکی ئامادەکراو

دوای ئەوەی پرۆژەی ڤیدیۆکەت ڕێکخست، ئەتوانیت سیفاتی پرۆژەکە خەزن بکەیت بۆ ئەوەی دواتر بتوانیت هەمان سیفات لە پرۆژەیەکی دیکەدا بەکاربێنیت.

1. لە لیستی File دا کلیك لەسەر Save Project Template بکە. دایەلۆگ بۆکسی Save Project Template دەکرێتەوە.
2. لێرەدا ناوێك بۆ پرۆژە ئامادەکراوەکە بنووسە.
3. لێرەدا ئەتوانیت ڕوونکردنەوەیەك بنووسیت.
4. پرۆژەی ئامادەکراوی تر لە لیستی Existing templates دا دەردەکەون. ئەگەر ویستت، ئەتوانیت کلیك لەسەر یەکێکیان بکەیت بۆ ئەوەی سیفاتی پرۆژەکەی ئێستات بچێت بۆ ئەو پرۆژە ئامادەکراوە. واتە گۆڕینەوەیە.
5. کلیك لەسەر OK بکە.




Save Project Template
Template name:
Home Video
Existing templates:
Previous Settings
DV (NTSC, 29.97fps, Audio 48kHz)
DV (PAL, 25fps, Audio 48kHz)
DV 16:9 (NTSC, 29.97fps, Audio 48kHz)
DV 16:9 (PAL, 25fps, Audio 48kHz)
Presentation Video (30fps, Indeo)
Presentation Video (25fps, Indeo)
Description :
No description required?
OK
Cancel
2
3
4
5

## خستنەکاری Smart Proxy

فایلی پرۆکسی (proxy) بریتین لە نوسخەی بچووک کراوە لە فایلی ڤیدیۆ. قەبارە و جوانی ئەم فایلانە کەم دەکرێتەوە تەنها بۆ یەک هۆ، بۆ خێراکردنی پرۆسەی دەستکاریکردنی فایلی ڤیدیۆی گەورە (وەکو فایلی HDV و فۆرماتەکانی دیکەی DVD).

کاتێک کە دەستکاری و تەماشای پرۆژەکەت دەکەیت بەشێوازی Instant Play، فایلی پرۆکسی بەکاردێن لەجیاتی فایلە ئەسڵییە گەورەکان. بەڵام کاتێک کە ڤیدیۆی کۆتایی بەرهەم دێنیت فایلە ئەسڵییەکان بەکاردێن.

بۆ ئەوەی سەرت نەیەشێنین، تەنها ئەوە بزانە کە بەکارهێنانی پرۆکسی ئیشەکەت خێراتر دەکات و رێدەگرێت لە خاوبوونەوەی کۆمپیوتەرەکەت لەکاتی ئیشکردن لەسەر فایلی ڤیدیۆیی گەورە.

### بۆ خستنەکاری پرۆکسی:

1. لە لیستی File دا کلیک لەسەر Preferences بکە.
2. کلیک لەسەر تابی Smart Proxy بکە.
3. نیشارەت لە بۆکسی Enable video proxy بدە.
4. کلیک لەسەر OK بکە.
5. ئەتوانیت لەجیاتی هەنگاوەکانی سەرەوە لە تووڵباری Timeline دا کلیک لەسەر دوگمەی Disable/Enable Video Proxy بکە.


Preferences
General
Edit
Associate
Preview
Smart Proxy
2
Enable undo
Levels of undo:
9
[1..99]
Number of recently opened files:
4
[1..9]
Return to the first frame after playing
Use temporary file when creating 8-bit optimized palettes
Display Options dialog box
Display data rate warning message
Display New dialog box
Automatically save every:
10
[1..60] minutes
Number of backups to
99
[1...999]
Default background color
Title safe area margin:
10
[5..20] %
Default inserted clip duration:
30
[1..9999] frames
Check Ulead's Web site every:
7
day(s)
Temporary folder:
C:\DOCUME~1\Ikram\LOCALS~
Display DV timecode on Source Window
Default number of tracks:
7
[2..99]
OK
Cancel


Preferences
General
Edit
Associate
Preview
Smart Proxy
3
Enable video proxy
Create proxy when video size is (or above):
1280 x 720
Proxy folder:
C:\DOCUME~1\Ikram\LOCALS~1\Temp\
Video proxy options:
MPEG files
24 bits, 720 x 480, 29.97 fps
Upper Field First
(DVD-NTSC), 16:9
Video data rate: 6000 kbps
Audio data rate: 224 kbps
Template...
Options...
OK
Cancel
4

## خەزنکردنی پڕۆژەیەکی ڤیدیۆ

کاتێك پڕۆژەیەك خەزن دەکەیت، بە فایلی DVP خەزن دەبێت. ئەمە وەك پێشتر باسمان کرد فایلێکی بچووکە کە هەموو زانیارییەکانی تێدایە دەربارەی پڕۆژەکەت، وەك زانیاری دەربارەی ئەو کلیپانەی لە پڕۆژەکەدان، لەگەڵ شوێنیان لەسەر Timeline، لەگەڵ هەر کاریگەرەییەك کە بەکارت هێنابێت. ئەم فایلە فیلم نییە و تەنها لە ڤیدیۆ ئێدیتەر دا دەکرێتەوە.

بۆ خەزنکردنی پڕۆژەکەت:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Save بکە لە تووڵباری Standard دا، لە لیستی File دا کلیك لەسەر Save بکە. دایەلۆگ بۆکسی Save As دەکرێتەوە.
2. شوێنێك بۆ خەزنکردنی فایلی پڕۆژەکەت دیاری بکە.
3. لێرەدا ناوێك بۆ پڕۆژەکەت بنووسە.
4. کلیك لەسەر Save بکە.



# بەشی سێیەم




# ئیشکردن لەسەر Timeline

Timeline ئەو شوێنەیە کە کلیپ و "ترانزیشن" و "ئۆڤەرلەی" ەکانتی لەسەر دادەنێیت. لەم بەشەدا باسی ئیشکردن دەکەین لەسەر Timeline، چۆنێتی دانانی کلیپە جیاوازەکان تێیدا، ئیشکردن لەگەڵ تراکەکان، دروستکردنی Timeline ی ئاڵۆز،



## دانانی کلیپ

کلیپەکان ئەو پێکهاتانەن کە فیلمەکەت پێك دەهێنن. کلیپێك ئەکرێت وێنە بێت، یان ڤیدیۆ، یان ترانزیشن، یان تایتڵ، یان ڕەنگی باکگراوند، یان فایلێکی دەنگ بێت. دوای ئەوەی کلیپەکان ئەکرێنە Timeline ەوە، ئەکرێت بقرتێنرێن و کاریگەرییان لەسەر دابنرێت بەبێ ئەوەی فایلە ئەسڵییەکان گۆڕانکارییان بەسەردا بێت. بۆ ئەوەی دەست بکەیت بە کار لەسەر پرۆژەی ڤیدیۆکەت، پێویستە سەرەتا کلیپ بخەیتە ناو Timeline ەوە. دوای ئەوەی کلیپەکانت دانا، ئەتوانیت دەست بکەیت بە دەستکاریکردن و ڕێکخستنیان بۆ دروستکردنی بەرهەمی کۆتایی.

## دانانی ڤیدیۆ، دەنگ و وێنە

1. کلیك لەسەر یەکێك لە دوگمەکانی دانانی ڤیدیۆ، دەنگ یان وێنە بکە لە تووڵباری Timeline دا. یاخود لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر یەکێك لە هەڵبژاردنەکان بکە. دایەلۆگ بۆکسێك دەکرێتەوە کە ڕێگەت پێ دەدات فایلێك هەڵبژێریت.

2. کلیك لەسەر فایلێك بکە.




3. ئەتوانیت بۆ دڵنیابوون لە فایلەکە تەماشای فایلەکە بکەیت بە کلیك کردن لەسەر دوگمەی Preview.




4. كليك لەسەر دوگمەی Play بكە.



5. دوای دڵنیابوونت کلیك لەسەر Open بکە.



6. ئێستا کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە Timeline دا بۆ دانانی کلیپەکەت. ئەگەر فایلەکەت دەنگ و ڕەنگ بێت، ئەوا لە کاتی دانان دا لە دوو شوێندا دەردەکەوێت، یەکێکیان بۆ ڤیدیۆ و ئەوی تر بۆ دەنگ.



## دانانی voiceover

لە کاتی دروستکردنی فیلمی دۆکیومێنتاری و پێشکەشکردنی ڤیدیۆوە، قسەکردن زۆرجار یارمەتی بینەرەکان دەدات لە بابەتەکە تێبگەن و گرنگی پێ بدەن. فرمانی voiceover ی ڤیدیۆ ئێدیتەر ڕێگەت پێ ئەدات قسەکردن دابنێیت لەسەر ڤیدیۆکانت بە هەنگاوەکانی خوارەوە.

1. Preview bar بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئەو بەشەی ڤیدیۆکە کە ئەتەوێت قسەکردنەکەی لەسەر دابنێیت.
2. لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر Voice File بکە. دایەلۆگ بۆکسی Insert Voice File دەکرێتەوە.
3. لێرەدا ئەتوانیت مایکرۆفۆنەکەت تاقی بکەیتەوە.
4. لە لاکێشەی Audio track selection دا ئەو تراکەی Timeline دیاری بکە کە ئەتەوێت کلیپی قسەکردنەکەی لەسەر دابنێیت.
5. بۆ دیاریکردنی شوێن بۆ خەزن کردنی فایلی قسەکردنەکە کلیك لێرە بکە و فۆڵدەرێك دیاری بکە.
6. کلیك لەسەر Start بکە بۆ دەستپێکردنی تۆمارکردنی دەنگت. بۆ وەستاندنی تۆمارکردن پەنجە بە کلیلی Esc دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت.

## دانانی کلیپی تایتڵ، ڕەنگ، لەگەڵ کلیپی بێ دەنگ

لەگەڵ کلیپەکانی ڤیدیۆ، دەنگ، قسەکردن و وێنە، تۆ ئەتوانیت کلیپی تایتڵ، ڕەنگ، لەگەڵ کلیپی بێ دەنگ لەسەر Timeline دابنێیت. کلیپی تایتڵ زۆرجار لەگەڵ کاریگەرییەکاندا بەکار دێت (لە بەشی پێنجەمدا بە درێژی باسیان دەکەین). کلیپی بێ دەنگ و کلیپی ڕەنگ ئەکرێت بەکاربهێنرێن بۆ پڕکردنەوەی شوێن لە Timeline دا بۆ ئەوەی دواتر کلیپی تر لە شوێنەکانیاندا دابنێیت. بۆ نموونە، لەوانەیە بتەوێت دەست بکەیت بە کارکردن لەسەر پرۆژەیەکی ڤیدیۆ، بەڵام هێشتا هەموو بابەتەکانی ناو پرۆژەکەت دەست نەکەوتبێت یان ئەو بابەتانەش هێشتا تەواو نەبووبن. تۆ ئەتەوانیت کلیپێکی ڕەنگ بەکاربێنیت بۆ ئەوەی لە جێگەی کلیپێکی وێنە یان ڤیدیۆ دای بنێیت و کلیپێکی بێ دەنگ دابنێیت بۆ ئەوەی جێگەی کلیپی دەنگ بگرێتەوە. کاتێك کە بابەتەکانت دەستکەوت، لە لیستی Clip دا Replace With بەکاربێنە بۆ گۆڕینەوەی کلیپی ڕەنگ یان بێ دەنگەکان بە کلیپە ڕاستەقینەکان. ئەگەر فیلتەر یان کاریگەریت لەسەر کلیپی ڕەنگ یان بێ دەنگەکان دانابێت ئەوا لەکاتی گۆڕینەوەی کلیپەکان لەناو ناچن بەڵکو بۆ کلیپە نوێکە دادەنرێن.

### بۆ دانانی کلیپێکی ڕەنگ:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Insert Color Clip بکە لە تووڵباری Timeline دا، یاخود لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر Color Clip بکە، یاخود کلیکی ڕاست لەسەر تراکێکی ڤیدیۆ بکە و Color Clip هەڵبژێرە. دایەلۆگ بۆکسی Insert Color Clip دەکرێتەوە.
2. لە بۆکسەکانی Duration دا درێژی کاتی کلیپەکە دیاری بکە. لە وێنەکەدا 10 چرکە دیاری کراوە.
3. ڕەنگی کلیپەکە دیاری بکە بە کلیك کردن لەسەر چوارگۆشەیەك یاخود نووسینی نرخی RGB.
4. ئەتوانیت کلیك لەسەر Pure Color بکەیت بۆ بە پەلە هەڵبژاردنی ڕەنگێکی ڕوون.
5. کلیك لەسەر OK بکە.
6. کلیپەکە لەسەر تراکێکی ڤیدیۆ دابنێ.

## دانانی پرۆژەیەکی ڤیدیۆ

ئەتوانیت پرۆژەیەکی میدیا ستودیۆ بهێنیتەوە ناوەوە بۆ پرۆژەکەی ئێستات. بە شێوەیەکی ئاسایی پرۆژەی دووەم بەشێوەی کلیپێکی خەیاڵی (Virtual clip) لە پرۆژەی یەکەمدا دادەنرێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەموو فایل و کاریگەرییەکانی پرۆژەی دووەم ئەکرێن بە یەك کلیپ و لە Timeline ی پرۆژەی دووەم دا دادەنرێت. دوای ئەوەی کلیپە خەیاڵییەکەت لەسەر Timeline دانا ئەتوانیت وەکو هەر کلیپێکی دیکەی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

بۆ دانانی پرۆژەیەك لە پرۆژەکەتدا:

1. لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر Project File بکە. دایەلۆگ بۆکسی Insert Project File دەکرێتەوە.
2. شوێنی پرۆژەکە (پرۆژەی دووەم) بدۆزەرەوە و کلیکی لەسەر بکە.
3. کلیك لەسەر Open بکە.
4. کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە Timeline دا بۆ دانانی کلیپی پرۆژەکە.


1
Video Editor - Untitled
File Project Edit View Capture Search Insert Clip Window Help Switch
Preview - Main Timeline Instant Play
Source
Video File...
Audio File...
Voice File...
Image File...
Title Clip...
Color Clip...
Silence Clip...
Auto Music...
Project File...
Smart Compositor...
Main Timeline
Video1
snow.WMV
Audio1
Audio2
Audio3
Insert an existing project file into the Timeline

بۆ دانانی پڕۆژەیەك لە پڕۆژەیەكی تردا بەشێوەیەك كە بابەتەكانی پڕۆژەكە نەكرێن بەیەك كلیپ، واتە كلیپ و كاریگەرییەكان بە سەربەخۆیی بهێنرێنە ناوەوە، ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدە:

1. لە لیستی File دا كلیك لەسەر Preferences بكە.
2. كلیك لەسەر تابی Edit بكە.
3. لە بۆكسی Append project as دا كلیك لەسەر Part of current project بكە.
4. كلیك لەسەر OK بكە.

ئێستا كاتێك كە پڕۆژە دەهێنیتە ناوەوە بابەتەكانی بە سەربەخۆیی دادەنرێن لەجیاتی یەك كلیپ.


Video Editor - Untitled
File Project Edit View Capture Search Insert Clip Window Help Switch
New... Ctrl+N
Open... Ctrl+O
Restore
Close Ctrl+W
Save Ctrl+S
Save As...
Save Project Template...
Data Rate Analysis...
Create
Convert
Media Player...
Select Device Control...
Print to Tape
Customize Frame Size...
Export
Preferences... F6
Playback Options...
1 Media Studio Sample DVP.dvp
Exit Ctrl+Q
Effects Manager
Audio2
Audio3
Customize the project's working environment
1


Preferences
2
General
Edit
Associate
Preview
Smart Proxy
Enable undo
Levels of undo:
9
[1..99]
Number of recently opened files:
4
[1..9]
Return to the first frame after playing
Use temporary file when creating 8-bit optimized palettes
Display Options dialog box
Display data rate warning message
Display New dialog box
Automatically save every:
10
[1..60] minutes
Number of backups to
99
[1...999]
Default background color
Title safe area margin:
10
[5..20] %
Default inserted clip duration:
30
[1..9999] frames
Check Ulead's Web site every:
7
day(s)
Temporary folder:
C:\DOCUME~1\Ikram\LOCALS~
Display DV timecode on Source Window
Default number of tracks:
7
[2..99]
OK
Cancel


Preferences
General
Edit
Associate
Preview
Smart Proxy
Apply color filter:
NTSC
PAL
Double-click on video track to insert:
Video files
Resample quality:
Good
Apply auto audio cross-fade
Audio cross-fade resampling:
Linear
Default field order option:
Frame-based
Default display aspect ratio:
Source frame size
Default stretch mode:
Stretch
Default transition effect:
Crossfade:F/X
Select...
Save image deinterlace
Scrubbing A/V ratio:
13
frame(s)
Append project as:
Virtual clip
Part of current project
Virtual clip
3
OK
Cancel
4

## دانان بەڕێگەی Push Away

دانانی Push Away پەیوەندی بە Ripple Editing ەوە هەیە و کۆنترۆلی کاریگەری کلیپی دانراو لەسەر کلیپەکانی تر دەکات لە Timeline دا. تۆ پێویستە لە No Ripple دا کار بکەیت بۆ ئەوەی ئەمە ئیش بکات و تەنها لەسەر یەك تراك کار دەکات. کلیلی ئەم ڕێگەیە ئەوەیە کە لەکاتی دانانی کلیپدا پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێیت.

## بۆ بەکارهێنانی ڕێگەی Push Away:

1. کلیك لەسەر دوگمەی No Ripple بکە لە تووڵباڕی Timeline دا.
2. کلیك لەسەر Video File بکە لە لیستی Insert دا.
3. پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ و بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر کلیلەکە کلیپەکەت لە تراکێکدا دابنێ. ئەگەر کلیك لەسەر سەرەتای کلیپێك بکەیت، کلیپەکە دەجووڵێت بۆ لای ڕاست بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ کلیپە نوێکە بکاتەوە.

ڕێگەی Push Away لەگەڵ ئەو کلیپانەشدا کار دەکات کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لە ناو تراکێکدا رایدەکێشیت.

## ئیشکردن لەگەڵ تراکەکاندا

Timeline لە دوو جۆر تراك پێکهاتووە، ڤیدیۆ و دەنگ. یەك تراکی سەرەکیی ڤیدیۆ هەیە، تراکەکانی دیکەش تراکی "ئۆڤەرلەی" ن، کە دواتر باس دەکرێن.

## زیادکردن و سڕینەوەی یەک تراک

بە پشت بەستن بە گەورە و بچووکی پرۆژەکەت، تۆ پێویستت بە زیادکردن یان سڕینەوەی تراکەکان دەبێت لە Timeline دا. هەنگاوەکانی خوارەوە باسی ئەم پرۆسەیە دەکەن:

1. کلیکی ڕاست لە کۆتایی لای چەپی تراکێکەوە بکە.
2. بۆ زیاد کردنی تراکێك، واتە بۆ دروستکردنی تراکێکی نوێ، کلیك لەسەر Add Track بکە.
3. بۆ سڕینەوەی تراکێك، هەر لەم لیستەدا کلیك لەسەر Delete Track بکە.



## دانانی چەند تراکێک پێکەوە

1. کلیکی ڕاست لە کۆتایی لای چەپی تراکێکەوە بکە.



2. کلیك لەسەر Add/Delete Tracks بکە.



3. کلیك لەسەر ئەم هەڵبژاردنە بکە.
4. لێرەدا دیاری بکە ئایا ئەتەوێت تراکە نوێکان لە پێش تراکی یەکەمەوە دابنرێن (Before first track) یان لە دوای تراکی کۆتاییەوە (After last track).
5. لێرەدا ژمارەی ئەو تراکانە دیاری بکە کە ئەتەوێت دایان بنێیت.
6. کلیك لەسەر OK بکە.



## سڕینەوەی چەند تراکێک پێکەوە

1. کلیکی ڕاستە لە کۆتایی لای چەپی تراکێکەوە بکە.
2. کلیك لەسەر Add/Delete Tracks بکە.
3. کلیك لەسەر ئەم هەڵبژاردنە بکە.
4. لێرەدا دیاری بکە ئایا ئەتەوێت تراکەکان لە پێش تراکی یەکەمەوە بسڕێنەوە (Before first track) یان لە دوای تراکی کۆتاییەوە (After last track).
5. لێرەدا ژمارەی ئەو تراکانە دیاری بکە کە ئەتەوێت بیانسڕیتەوە.
6. کلیك لەسەر OK بکە.




Video Editor - Untitled
File Project Edit View Capture Search Insert Clip Window Help Switch
Preview - Main Timeline Instant Play
Effects Manager
Source
Main Timeline
Video1
Add Track
Delete Track
Add/Delete Tracks...
Add or delete tracks in the timeline
2


Add/Delete Tracks
Options
Add tracks
Delete tracks
Placement
Before first track
After last track
Number of tracks: 4
OK
Cancel
3
4
5
6

## دوگمەکانی تراک

| | |
|---|---|
| دوگمەی ناوی تراک Video1 | کاتێك کلیکی لەسەر دەکرێت هەموو کلیپەکانی ناو تراکەکە هەڵدەبژێررێن. |
| | دوگمەی لۆك: کاتێك تراکەکە قوفڵ (یان لۆك) کراوە، ناتوانرێت کلیپەکانی بجوڵێنرێن یان دەستکاری بکرێن. |
| | دوگمەی سۆڵۆ: کاتێك کلیکی لەسەر کرابێت تەنها تراکەکەی ئێستا کار دەکات لە کاتی تاقیکردنەوە یان بەرهەمهێنانی فیلمەکە و هەموو تراکەکانی تر لەکاردەکەون. |
| | دوگمەی شاردنەوە: کاتێك کلیکی لەسەر کرابێت، تراکەکە دەشاررێتەوە و لە تاقیکردنەوە یان بەرهەمهێناندا بەشدار نابێت. |



## دیاریکردنی شێوازی دەرکەوتنی کلیپەکان

زۆرجار کۆمەڵێك کلیپت دەبێت کە پێکەوە دەکەونە کار لە پرۆژەیەکدا. بۆ نموونە، ئەکرێت ڤیدیۆیەکی سەرەکیت هەبێت لە تراکی Video1 دا، پاشان کلیپێکی دیکە کە تایتڵ بێت لە Video2 دا. ئەو کلیپانەی کە لە ئاستەکانی سەرەوەدان بەسەر کلیپەکانی ئاستی خوارەوەدا کار دەکەن، واتە لە کاتی ئیش کردندا بابەتەکانی ناو تراکی Video2 کە نووسینی تایتڵەکەیە لەسەر ڤیدیۆ سەرەکییەکەی Video1 پیشان دەدرێت. پێویستە ئەم تایبەتمەندێتییەی میدیا ستودیۆ بۆ سوودی پرۆژەکەت بەکاربێنیت.




ئەنجام:



## دیاریکردنی شێوازی پیشاندانی کلیپەکان لەسەر Timeline

ئەکرێت کلیپەکانی ناو تراکەکانی Timeline بە چوار شێوە پیشان بدرێن. شێوازەکانیش بریتین لە:

- Filmstrip
- Waveform
- Thumbnail
- Filename

Filmstrip و Waveform کلیپەکان بەشێوەی وێنەیی پیشان ئەدەن (کلیپی ڤیدیۆیی بەشێوەی وێنە، کلیپی دەنگ بەشێوەی وێنەی شەپۆلەکان) و ڕێگەت پێ ئەدەن سەرانسەری بابەتی کلیپەکە ببینیت. لەگەڵ ئەوەی ئیشکردن لەگەڵ شێوازە وێنەییەکان ئەکرێت ئاسانتربێت، کۆمپیوتەرەکەت کاتی دەوێت بۆ دووبارە پیشاندانی وێنەی کلیپەکان دوای ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەسەریان. بۆ ئەوەی کۆمپیوتەرکەت خێراتر کاربکات، بەڵام کەمێك وێنەشت پیشان بدرێت، شێوازی پیشاندانی Thumbnail هەڵبژێرە. ئەم شێوازە وێنەی سەرەتا و کۆتایی کلیپەکەت پیشان دەدات لەگەڵ ناوی کلیپەکە. شێوازی کۆتاییش، Filename، کلیپەکان پیشان دەدات بەپێی ناوەکانیان و بەبێ هیچ وێنەیەك. ئەم شێوازە خێراترینە لەبەر ئەوەی خێراتر پیشان دەدرێت، بەڵام وەك ووتمان وێنەی لەگەڵدا نییە.

بۆ گۆڕینی شێوازی پیشاندانی کلیپەکان:

1. لە لیستی View دا کلیك لەسەر Display Mode بکە. دایەلۆگ بۆکسی Timeline Display Mode دەکرێتەوە.




2. کلیك لەسەر ئەم هەڵبژاردنە بکە (ئەگەر کلیکی لەسەر نەکرابوو).




3. لێرەدا شێوازی پیشاندانی تراکەکانی ڤیدیۆ دیاری بکە.



4. ئەگەر هەڵبژاردنی دووەم یا سێیەمت هەڵبژارد، ئەتوانیت کلیك لەسەر ئەم بۆکسانە بکەیت بۆ دیاریکردنی ڕەنگێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو ناوچانەی کە بە وێنە پڕنەکراونەتەوە لە جەستەی کلیپی ناو تراکەکاندا.




5. لێرەدا شێوازی پیشاندانی کلیپەکان دیاری بکە لە تراکە دەنگییەکاندا. (ئایا وێنەی شەپۆلی دەنگ بێت یان تەنها ناوی فایلەکە؟)



6. ئەگەر کلیکت لەسەر هەڵبژاردنی دووەم کردن، ئەتوانیت کلیك لەسەر ئەم بۆکسە بکەیت بۆ دیاریکردنی ڕەنگێك بۆ کلیپەکان.




7. دوای تەواوبوونی هەڵبژاردنەکانت کلیك لەسەر OK بکە.



## هێنانە پێشەوە یان بردنە دواوەی Timeline

Timeline ئەتوانێت پرۆژەکەت لە دووری جیاوازەوە پیشان بدات. تۆ ئەتوانیت ڤیدیۆی کلیپێك ئەوەندە بهێنیتە پێشەوە کە وێنەکانی یەك لە دوای یەك دەر بکەون، ئەشتوانیت بیبەیتە دواوە بۆ ئەوەی هەموو کلیپەکە بە یەکجار دەربکەوێت.

بۆ بردنە دواوە و هێنانە پێشەوە:

1. دیارخەری Timeline Zoom ڕابکێشە بۆ لای چەپ بۆ بردنە دواوەی کلیپەکە و بۆ لای ڕاست بۆ هێنانە پێشەوەی کلیپەکە.



2. ئەشتوانیت کلیك لەسەر دوگمەی Zoom بکەیت پاشان کلیك لەسەر Timeline بکەیت بۆ هێنانە پێشەوەی کلیپەکە. بۆ بردنە دواوەی کلیپەکە پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ و پاشان کلیك لەسەر Timeline بکە.



# Timeline ی گشتی و Timeline کورت

لە ڤیدیۆ ئێدیتەردا دوو شێوازی پیشاندانی Timeline ت هەیە: General Timeline و Summary Timeline:

General Timeline شێوازی ئاسایی پیشاندانی کلیپەکان پێشکەش دەکات. کلیپەکان بە قەبارەی راستەقینەیان پیشان دەدرێن، واتە کلیپی گەورە لەسەر Timeline بە گەورەیی دەردەکەوێت و کلیپی بچوك بە بچوکتر دەردەکەوێت. ئەمە ئەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی هەندێك کلیپ لە Timeline دا بە یەکجار دەرنەکەون بەهۆی گەورەییان، لەم حاڵەتەدا پێویستت بە جووڵاندنی سکرۆڵی Timeline هەیە بۆ بینینی بەشەکانی دیکەی کلیپەکە.

لە شێوازی Summary Timeline دا وێنەیەکی گشتیی پرۆژەکەت دەبینیت. هەر کلیپێك بە یەك وێنە دەردەکەوێت بەبێ گوێدان بە قەبارەی کلیپەکە. ئەتوانیت سوود لەم شێوازە وەربگریت بۆ سەیرکردنی هەموو کلیپەکانی ناو پرۆژەکەت پێکەوە، بەتایبەتی ئەگەر کلیپەکان زۆربن و قەبارەیان جیاوازبێت، بۆ ئەوەی هیچ کلیپێك لەبیر نەکەیت.

Timeline ی گشتی (General Timeline):




Timeline ی کورتکراوە (Summary Timeline):



## بۆ گۆڕینی شێوازی پیشاندانی Timeline:

1. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Summary Timeline بکە بۆ گۆڕینی شێوازی پیشاندانەکە لە General Timeline ەوە بۆ Summary Timeline.



2. بۆ دووبارە گۆڕینی شێوازی پیشاندانی Timeline لە Summary Timeline ەوە بۆ General Timeline، لە لیستی Window دا کلیك لەسەر General Timeline بکە، کە هەر لە شوێنی پێشووی Summary Timeline دایە.



ULEAD
CREATIVE INTELLIGENCE

## بەشی چوارەم




# ئەنجامدانی گۆڕانکاری

### دیاریکردنی کلیپ لە Timeline دا

بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەسەر کلیپەکان، یەکەمجار پێویستە دیارییان بکەیت. ئەم کردارەش ئەکرێت شتێکی ئاسانی وەك کلیك کردن لەسەر کلیپێك بێت، بەلام تەکنیکی پێشکەوتووتر ئەکرێت زۆر بەسوود بێت. دوو جۆر دیاریکردن هەیە کە ئەتوانیت ئەنجامیان بدەیت: دیاریکردنی کلیپ، لەگەڵ دیاریکردنی کات.

## بەکارهێنانی ئامرازی دیاریکردنی کلیپ

ئامرازی دیاریکردنی کلیپ ڕێگەت پێ ئەدات کلیپ دیاری بکەیت لە هەر تراکێك لە Timeline دا. تۆ ئەتوانیت کلیپی تاك دیاری بکەیت بە کلیك کردن لەسەریان. دوای ئەوەی کلیپێکت دیاری کردووە، ئەتوانیت ڕای بیگوازیتەوە یان سنوورەکانی ڕابکێشیت بۆ بڕین لە بابەتی کلیپەکە.

ئامرازی دیاریکردنی کلیپ



## بۆ دیاریکردنی هەموو کلیپەکانی ناو تراکێک

کلیك لەسەر دوگمەی ناوی تراك بکە لە لای چەپی تراکەکەوە.




## بۆ دیاریکردنی هەموو کلیپەکانی ناو Timeline:

1. لە لیستی Edit ئیشارەتی ماوسەکە لەسەر Select بووەستێنە.
2. لە لیستە نوێکەدا کلیك لەسەر All بکە.




## بۆ دیاریکردنی چەند کلیپێک پێکەوە:

1. کلیك لەسەر ئامرازی دیاریکردنی کلیپ بکە.
2. پەنجە لەسەر کلیکی Shift ی کیبۆردەکەت دابنێ.
3. پەنجە لەسەر دوگمەی چەپی ماوسەکە دابنێ و ماوسەکە ڕابکێشە بەسەر ئەو ناوچەیەی تراکەکەدا کە ئەتەوێت کلیپەکانی تێدا دیاری بکەیت (بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر دوگمەکە).

## بەکارهێنانی ئامرازی دیاریکردنی کات

ئامرازی دیاریکردنی کات ڕێگەت پێ ئەدات ماوەیەکی دیاریکراو لە کات دیاری بکەیت، بەبێ گوێدان بە کلیپەکان.

بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامرازە:

1. کلیك لەسەر دوگمەی ئامرازی دیاریکردنی کات بکە.
2. ماوسەکەت بەسەر ئەو ناوچەیەی Timeline دا ڕابکێشە کە ئەتەوێت دیاری بکەیت.



## بەکارهێنانی ئامرازی دیاریکردنی تراک

ئامرازی دیاریکردنی تراک سودی هەیە کاتێك ئەتەوێت تراکێکی تەواو یان بەشێك لە تراکێك دیاری بکەیت.

## بۆ بەکارهێنانی ئامرازی دیاریکردنی تراک:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Track Selection Tool بکە لە توولبارِی Timeline دا.
2. کلیك لەسەر کلیپێك بکە. هەموو تراکەکە دیاری دەبێت.



## گروپ کردن یان لکاندنی کلیپ

کاتێك کە بەردەوامیت لە ئیشکردن لەسەر پرۆژەکەت، تا بێت ئاڵۆزتر دەبێت، ئەکرێت سوود ببینیت لە گروپکردنی هەندێك کلیپ پێکەوە بۆ ئەوەی بتوانیت لە کاتی گواستنەوەدا وەکو یەك کلیپ مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

### بۆ گروپکردنی کلیپ:

1. چەند کلیپێك دیاری بکە بە پەنجە دانان لەسەر کلیلی Shift و ڕاکێشانی ماوسەکە بەسەر کلیپەکاندا.
2. لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Group بکە.




3. بۆ جیاکردنەوەی کلیپەکان، لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Ungroup بکە.

## ئیشکردن لەگەڵ کلیپەکان

کلیپەکان بناغەی پڕۆژەکەتن و زانینی چۆنێتی کارکردن لەسەریان یەکێکە لە گرنگترین بۆ کەت کردن یان کۆپیکردنی کلیپێکی دیاریکراو، ئەتوانیت یەکێك لەم ڕێگانە بەکاربێنیت:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Cut یان Copy بکە لەسەر تووڵباری Standard.



2. لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Cut یان Copy بکە.




3. پەنجە لەسەر کلیلی Ctrl دابنێ و کلیپەکە بۆ شوێنێکی تر ڕابکێشە.
4. بۆ کەت Ctrl + X و بۆ کۆپی Ctrl + C بکە.
5. کلیکی ڕاست لەسەر کلیپێك بکە و Cut یان Copy لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

## بۆ دانانی کلیپێکی کەت یان کۆپی کراو:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Paste بکە.




2. لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Paste بکە.

## جیاکردنەوەی دەنگ لە ڤیدیۆ

کلیپی ڤیدیۆیی بە زۆری لەگەڵ دەنگدا دێن. لە Timeline دا، ئەو دەنگەی کە لەگەڵ ڤیدیۆکەدایە دەخرێتە ناو تراکی دەنگی تایبەت بە ڤیدیۆکەوە، بۆ نموونە دەنگی تراکی Video1 لە Audio1 و Video2 لە Audio2 دایە و دوو کلیپەکە (ڤیدیۆ و دەنگ) پێکەوە بەستراون و یەك پێکهاتەیان دروست کردووە. بۆ سڕینەوە یان گواستنەوەی یەکێك لە کلیپەکان بە جیا، پێویستە یەکەمجار دوو کلیپەکە جیابکرێنەوە.

ئەم جیاکردنەوەیە سوودی هەیە کاتێك ئەتەوێت کلیپێك بۆ گۆرانییەك دروست بکەیت، تۆ پێویستت بە دەنگی ئەسڵیی ڤیدیۆکە نابێت، بەڵکو دەنگەکە لادەبەیت و دەنگی گۆرانییەکەی بۆ دادەنێیت.

### بۆ جیاکردنەوەی دەنگ لە کلیپی ڤیدیۆ:

1. کلیپەکە دیاری بکە.
2. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Split بکە.



3. بۆ پێکەوە بەستنەوەی دوو کلیپی دەنگ و ڕەنگ کە لە هەنگاوی (2) دا جیاکراونەتەوە، یەکێك لە دو کلیپەکە دیاری بکە و لە لیستی Clip دا Unite هەڵبژێرە.



## گۆڕینی ئاستی دەنگی کلیپەکان

کلیپە دەنگییەکان کۆنترۆڵێکی ئاستی دەنگیان هەیە کە بەکاردێت بۆ ڕێکخستنی ئاستی دەنگ (ڤۆلیوم).

بۆ گۆڕینی ئاستی دەنگی کلیپێك لە Timeline دا:

1. کلیپەکە دیاری بکە.
2. کلیك لەسەر هێڵی ناوەڕاستی کلیپەکە بکە لە ئەو شوێنەدا کە ئەتەوێت ئاستی دەنگەکەی بگۆڕیت. چوارگۆشەیەك دروست دەبێت کە ڕێگەت پێ ئەدات ئاستی دەنگەکە کۆنترۆڵ بکەیت.



3. بۆکسەکان ڕابکێشە بۆ سەرەوە بۆ زیادکردنی دەنگ و بۆ خوارەوە بۆ کەم کردنەوەی ئاستی دەنگ.



## گۆڕینی خێرایی کلیپەکان

ئەتوانیت خێرای ئیشکردنی کلیپێك بگۆڕیت، بۆ ئەوەی ڤیدیۆکە خاوتر یان خێراتر دەرکەوێت.

### بۆ گۆڕینی خێرایی کلیپەکان:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Time Stretch Mode بکە لە تووڵباڕی Timeline دا.



2. سووچی کلیپێك ڕابکێشە لەلای چەپەوە یان ڕاستەوە.




ڕێگەیەکی تر بۆ گۆڕینی خێرایی کلیپ بریتییە لە بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Speed:

1. کلیپەکە دیاری بکە.
2. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Speed بکە. دایەلۆگ بۆکسی Speed دەکرێتەوە.




3. لە هەڵبژاردنی Rate دا ئەتوانیت خێراییەکی تایبەت دیاری بکەیت بۆ ئیشکردنی کلیپەکە. خێرایی ئاسایی بریتییە لە 100، ئەگەر ژمارەیەك دیاری بکەیت لە 100 بچووکتربێت کلیپەکە خاوتر کاردەکات، ژمارەیەکی گەورەتر لە 100 کلیپەکە خێراتر کارپێدەکات. ئەتوانیت لە ژمارە 10 تا 1000 لە لاکێشەکەدا بنووسیت.




4. ئەشتوانیت کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Length بکەیت و درێژی کلیپەکە بەپێی کات دیاری بکەیت. ئەگەر کلیپەکە 20 چرکە بێت و تۆ 30 چرکە بنووسیت ئەوا کلیپەکە خاوتر دەبێت و ئەگەر ژمارەیەکی لە 20 بچووکتر بنووسیت ئەوا کلیپەکە خێراتردەبێت.



## هەڵگەڕاندنەوەی کلیپ

ئەتوانیت وێنەکانی کلیپێك هەڵبگێڕیتەوە بۆ ئەوەی ڤیدیۆی کلیپەکە بە پێچەوانەوە کاربکات، واتە لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا:

1. کلیپەکە دیاری بکە.
2. لە لیستی Clip دا Reverse هەڵبژێرە.




هەر دەنگێك لەگەڵ ڤیدیۆکەدا بێت پێچەوانە دەکرێت.

## دووبارە لکاندنەوەی کلیپەکان

هەرکاتێك پرۆژەیەك دەکەیتەوە، ڤیدیۆ ئێدیتەر تەماشای کلیپەکانی ناو پرۆژەکە دەکات و پاشان دەگەڕێت بۆ فایلی ئەسڵیی هەر یەکێك لە کلیپەکان. ئەگەر فایلە ئەسڵییەکە نەدۆزێتەوە (واتە ئەگەر فایلە ئەسڵییەکە گوازرابێتەوە بۆ شوێنێکی تر لە کۆمپیوتەرەکەتدا) ئەوا دایەلۆگ بۆکسی Relink دەکرێتەوە کە داوات لێدەکات کلیپەکان ببەستیتەوە بە فایلە ئەسڵییەکانیانەوە:

1. بۆ بەستنەوەی فایلەکان، کلیك لەسەر Relink بکە.




2. دایەلۆگ بۆکسی Relink Video File دەکرێتەوە. لێرەدا فایلەکە بدۆزەرەوە و کلیکی لەسەر بکە.
3. کلیك لەسەر Open بکە. پرۆژەکەت بۆ دەکرێتەوە و ئەتوانیت دەستبکەیت بە کار تێیدا.



## فریزکردنی فرەیم

وەك پێشتر باسمان کرد هەموو فایلێکی ڤیدیۆیی لە ژمارەیەکی زۆر وێنە پێکهاتووە کە "لە تەنیشت یەکەوە دانراون". بە هەریەکێك لەم وێنانە دەوترێت فرەیم (frame). فریزکردن (freezing) واتە بەستن (وەك بەستنی ئاو کە ئەبێت بە سەهۆڵ)، ئەکرێت ووشککردنیشی پێ بوترێت. فریزکردنی فرەیم تەکنیکێکە لە کاری مۆنتاژدا بەکاردێت، لە شوێنێکی کلیپێکی ڤیدیۆدا فرەیمێك ووشك دەکرێت، واتە یەك فرەیم دەوەستێت و وەکو وێنەیەکی وەستاو دەردەکەوێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، پاشان ڤیدیۆکە دەچێتەوە باری ئیشکردنی ئاسایی خۆی.

1. کلیپێك دیاری بکە و ڤیدیۆکەی لە دەنگەکە جیابکەرەوە (بەهۆی فرمانی split کە پێشتر باسمان کرد).
2. کلیکی ڕاست لەسەر کلیپەکە بکە و لە لیستەکەدا Freeze Frame هەڵبژێرە. دایەلۆگ بۆکسی Freeze Frame دەکرێتەوە.



3. دیارخەری ژێر ویندۆی Preview بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی ئەو فرەیمەی کە ئەتەوێت فریزی بکەیت. واتە بۆ دۆزینەوەی کاتەکەی کە لەژێر دیارخەرەکەدا دەردەکەوێت.



4. ئیشارەت لە هەڵبژاردنەکانی Freeze before frame (فریزکردن لە پێش فرەیمی دیاریکراوەوە بێت) یان Freeze after frame (فریزکردنی فرەیم لەدوای فرەیمی دیاریکراوەوە بێت) یان هەردووکیان بدە، پاشان لە لاکێشەکاندا فرەیمەکە دیاری بکە بەپێی کاتەکەی.

5. لێرەدا دیاری بکە فرەیمەکە بۆ ماوەی چەند چرکە فریز بکرێت.




6. کلیك لەسەر OK بکە.



## دیاریکردنی field options بۆ ڤیدیۆ کلیپەکان

ڤیدیۆ ئێدیتەر ڕێگەت پێ ئەدات ئیش لەگەڵ دوو جۆری ڤیدیۆدا بکەیت: field-based و frame-based.
ئەگەر ڤیدیۆکەت بۆ تەلەفزیۆنە، پێویستە field-based هەڵبژێریت بۆ ئەوەی ڤیدیۆکە بە ڕێکوپێکی کاربکات.
بەڵام ئەگەر ڤیدیۆکەت بۆ کۆمپیوتەرە، پێویستە frame-based هەڵبژێریت.

### بۆ دیاریکردنی جۆری ڤیدیۆ:

1. کلیپێك دیاری بکە.
2. لە لیستی Clip دا Media Source Options هەڵبژێرە, دایەلۆگ بۆکسی Media Source Options دەکرێتەوە.



3. لێرەدا هەڵبژاردنەکەت دیاری بکە. بۆ کۆمپیوتەر Frame-based هەڵبژێرە، بۆ تەلەفزیۆنیش هەڵبژاردنی دووەم یان سێیەم. ئەگەر ڤیدیۆکەت بۆ تەلەفزیۆنە پێویستە هەردوو جۆرەکە تاقی بکەیتەوە بۆ ئەوەی بزانیت کام هەڵبژاردن باشترین ئەنجامی دەبێت.




4. کلیك لەسەر OK بکە.



## نیشکردن لەگەڵ cues

Cues (کیوز) بریتین لە چەند نیشانەیەك کە لە پرۆژەی ڤیدیۆدا دادەنرێن. کاتێت کە پرۆژەکان گەورەتر و ئالۆزتر دەبن، تۆ ئەتوانیت cues بەکاربێنیت بۆ بەپەلە بازدان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆ ڕێکخستنی کلیپەکان لە کاتی دانانیاندا، یاخود شوێنی ڕووداوێك دیاری بکەیت. ئەتوانیت ناو و ڕوونکردنەوە لەسەر cues دابنێیت. ئەکرێت cues لەسەر پرۆژەکان دابنرێن، یان لەسەر کلیپی سەربەخۆ. هەروەها جۆرێکی تایبەتی cues هەیە پێی دەوترێت chapter cues کە بۆ ئەو پرۆژانە بەکاردێت کە دەنێررێنە دەرەوە بۆ پرۆگرامێکی دروستکردنی DVD وەك Ulead DVD MovieFactory.

### دانانی cues بۆ پرۆژەکان

ئەتوانیت ڕاستەوخۆ cues لەسەر cue bar دابنێیت یاخود لە ویندۆی Preview دا.

بۆ دانانی cue لەڕێگەی cue bar ەوە:

1. ماوسەکە بجوولێنە بۆسەر cue بار (واتە ناوچەی ژێر ڕاستەکە). دیمەنی ئیشارەتەکە دەگۆڕێت.
2. کلیك لەسەر شوێنێك بکە بۆ دانانی cue. سێگۆشەیەکی شین دەردەکەوێت کە پیشان دەدات cue لەوێدا هەیە.







بۆ دانانی cue بە بەکارهێنانی ویندۆی Preview:

1. کلیك لەسەر Play بکە (یاخود پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت) بۆ پیشاندانی پرۆژەکە لە ویندۆی Preview.




2. بە ڤیدیۆکەدا بگەڕێ هەتا ئەو شوێنە دەدۆزیتەوە کە ئەتەوێت cue ی لەسەر دابنێیت. پەنجە بە کلیلی F5 دا بنێ کاتێك ویستت cue ەکە دابنێیت.




3. cue لەسەر cue bar ی Timeline دەردەکەون.



## دانانی cues لەسەر کلیپەکان

ئەتوانیت cue بۆ کلیپی تاك دابنێیت. لێرەدا cue زۆر بەسوودە بۆ ڕێکخستنی کلیپەکان لە تراکی جیاوازدا و پێکەوە لکاندنی دەنگ و ڤیدیۆ بەشێوەیەکی وورد و دروست. لەم جۆرەدا cue ەکان ڕەشن و لە ژێر کلیپەکاندا دەردەکەون.

## بۆ دانانی cue لەسەر کلیپەکان:

1. کلیپەکە لە ویندۆی Source دا بکەرەوە (دەبڵ کلیکی لەسەر بکە یاخود ڕای بکێشە بۆ ناو ویندۆی Source.




2. ئیش بە کلیپەکە بکە یاخود بازبدە بۆ ئەو شوێنەی کە ئەتەوێت بە بەکارهێنانی کۆنترۆڵەکان.




3. کە گەیشتیت بە شوێنی خوازراو، پەنجە بە کلیلی F5 دا بنێ.

4. بەردەوام بە لە دانانی cue و لە کۆتاییدا کلیك لەسەر دوگمەی Apply بکە.




## بۆ پیشاندانی cue ەکان لەژێر کلیپەکان لە Timeline دا:

1. لە لیستی View دا کلیك لەسەر Timeline Display Mode بکە. دایەلۆگ بۆکسی Timeline Display Mode دەکرێتەوە.




2. ئیشارەت لە دوو بۆکسی Show cue bar on track بدە.

3. کلیك لەسەر OK بکە.



## بەکارهێنانی Cues

حەزتان cues بەکاربێنیت بۆ بازدان بە خێرایی بۆ شوێنێکی دیاریکراو لە پڕۆژەکەتدا.

1. لە لیستی Search دا کلیك لەسەر Go To بکە. دایەلۆگ بۆکسی Go To ئەکرێتەوە.




2. لە ستوونی Cue Time دا هەموو cue ەکانی ناو پڕۆژەکە پیشان دەدرێن. کلیك لەسەر ئەو cue ە بکە کە ئەتەوێت بۆی بچیت.




3. کلیك لەسەر Go To بکە.



## دۆزینەوەی ناوچەی بەتاڵ لە Timeline دا

دوای کارکردن لەسەر پرۆژەکەت بۆ ماوەیەك و دانان و لابردنی بابەتی زۆر، ئەکرێت هەندێك ناوچەی بەتاڵ لەسەر Timeline بەجێ هێشتبێت بۆ ئەوەی دواتر پڕی بکەیتەوە. بۆ دۆزینەوەی ئەم ناوچانە:

1. لە لیستی Search دا کلیك لەسەر Find Empty Time Slots بکە.




2. لە دایەلۆگ بۆکسی Find Empty Time Slots دا ئەو ناوچانەی پرۆژەکەت دیاری دەکرێن کە بەتاڵن، لەگەڵ درێژ ماوەکانیان. ئەگەر لەسەر دەنگ کار دەکەیت ئەوا لە بۆکسەکەدا Video بکە بە Audio.



## کورتکردنەوە یان درێژکردنەوەی کلیپ

مەبەستمان لە کورتکردنەوە لابردنی بەشێکی کلیپێکە بۆ ئەوەی کورت بێتەوە، درێژکردنەوەش واتە دووبارە دانانەوەی ئەو بەشەی کە پێشتر لابرابوو. ئەم کردارە ئەکرێت پێی بوترێت قرتاندن، بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەیە کە کلیپەکە کەرت ناکەیت، بەڵکو بەشێکی لێ دەکەیتەوە و فڕەی دەدەیت، کە پاشان ئەتوانیت بیگەڕێنیتەوە.

### بۆ کورتکردنەوە یان درێژکردنەوەی کلیپێک:

1. کلیك لەسەر ئامرازی دیاریکردنی کلیپ بکە.




2. سنووری چەپ یان ڕاستی کلیپێك ڕابکێشە.



## کورتکردنەوە یان درێژکردنەوە لە ڕێگەی ویندۆی Source

یەکێک لە ڕێگەکانی کورتکردنەوە و درێژکردنەوەی کلیپ بریتییە لە ویندۆی Source، بە هەنگاوەکانی خوارەوە:

1. دەبڵ کلیک لەسەر کلیپێک بکە لە Timeline دا.
2. لە ویندۆی Source دا، دیارخەرەکە ڕابکێشە بۆ ئەو شوێنەی کە ئەتەوێت ببێتە سەرەتای کلیپەکە و پەنجە بە کلیلی F3 دا بنێ.




3. دیارخەرەکە ڕابکێشە بۆ ئەو شوێنەی کە ئەتەوێت ببێتە کۆتایی کلیپەکە و پەنجە بە کلیلی F4 دا بنێ.



4. کلیك لەسەر Apply بکە.



## بەکارهێنانی ویندۆی Trim

ویندۆی Trim ووردترین ڕێگەیە بۆ کورتکردنەوە یان درێژکردنەوەی کلیپ، فرەیم بە فرەیم.

بۆ بەکارهێنانی ویندۆی Trim:

1. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Trim Window بکە.




2. لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Trim Options بکە و کلیك لەسەر یەکێك لە هەڵبژاردنەکا بکە. (دواتر باسی هەڵبژاردنەکان ئەکەین.)




3. سنووری کلیپێك ڕابکێشە کە ئەتەوێت کورت یان درێژی بکەیتەوە. ویندۆی Trim دوو فرەیم پیشان ئەدات. کلیپەکە لە هەر شوێنێکدا پەنجە لەسەر کلیك هەڵبگریت، کلیپەکە کەرت دەکرێت. ئەتوانیت ویندۆکانی تر دابخەیت بۆ ئەوەی کارکردن لەسەر ویندۆی Trim ئاسان بێت.

## بەکارهێنانی ئامرازی مەقەست بۆ کورتکردنەوەی کلیپەکان

بۆ کەرتکردنی کلیپێك:

1. کلیك لەسەر دوگمەی Scissors Tool بکە.




2. کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە کلیپەکەدا بۆ قرتاندنی.



## بەستنەوەی کلیپی کەرت کراو

: دوو کلیپ کە پێشتر بەهۆی ئامرازی مەقەستەوە کەرت کرابن لە تەنیشت یەکەوە دابنێ وەک پێش کەرتکردنەکە.




2. کلیك لەسەر ئامرازی Scissors بکە.

3. کلیك لە نێوانی دوو کلیپەکە بکە.

## دیاریکردنی هەڵبژاردنەکانی Trim

لێرەدا باسی هەڵبژاردنەکانی Trim Options دەکەین لە لیستی Edit دا.




Normal: ڕێگەت پێ ئەدات بە شێوەیەکی ئاسایی کلیپەکان کورت یان درێژ بکەیتەوە.

Overwrite: ڕێگەت پێ ئەدات کلیپێك درێژ بکەیتەوە هەتا بەسەر کلیپێکی دیکەدا دەچێت، کلیپی دووەم کورت دەبێتەوە لەگەڵ درێژبوونی کلیپی یەکەم. دواتر ئەگەر کلیپی یەکەم کورت بکەیتەوە ئەوا کلیپی دووەم هەر بە کورتی دەمێنێتەوە.

Stitch: ڕێگەت پێ ئەدات کلیپێك درێژ بکەیتەوە بەسەر کلیپێکی دیکەدا، کلیپی دووەم کورت دەبێتەوە لەگەڵ درێژبوونەوەی کلیپی یەکەم، بەڵام دواتر ئەگەر کلیپی یەکەم کورت بکەیتەوە ئەوا کلیپی دووەم درێژ دەبێتەوە.

# Smart Trim

ـو ڕێگانەی کە پێشتر باسمان کردن بۆ کورتکردنەوە و درێژکردنی کلیپ گۆڕانکاری لە فایلە ئەسڵییەکاندا ـنجام نادەن، بەڵکو کاریان تەنها لەناو پڕۆژەکەدایە. ئەم تایبەتمەندێتییە شتێکی زۆر بەسوودە چونکە ڕێگەت ـی ئەدات بە ئارەزووی خۆت کار لەگەڵ کلیپەکاندا بکەیت بەبێ ئەوەی خەمی زیان گەیاندنت هەبێت بە فایلی ڤیدیۆ ئەسڵییەکان. بەڵام هەندێك جار، بۆ نموونە کاتێك هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکەت شوێنی بەتاڵی کەمە، پێویست دەکات کە فایلی سەر کۆمپیوتەرەکەت کورت بکەیتەوە. بۆ ئەم کردارە:

1. سەرەتا کلیپەکەت کورت یان درێژ بکەرەوە بە ڕاکێشانی سنوورەکان.
2. لە لیستی Project دا Smart هەڵبژێرە و لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Smart Trim بکە.




3. کلیك لەسەر Trim بکە. دایەلۆگ بۆکسی Video Editor دەکرێتەوە.




4. دایەلۆگ بۆکسەکە پرسیارت لێ دەکات ئایا ئەتەوێت فایلە ئەسڵییەکە دەستکاری بکەیت یان فایلێکی نوێ دروست بکەیت بە گۆڕانکارییەکان و فایلە ئەسڵییەکە وەك خۆی بمێنێتەوە. بۆ سڕینەوەی فایلە ئەسڵییە کلیك لەسەر Yes بکە. بۆ دروستکردنی فایلێکی نوێ کلیك لەسەر No بکە.




5. چاوەڕی بکە تا پرۆسەکە کۆتایی دێت.
6. دایەلۆگ بۆکسی Smart Command Result دەکرێتەوە. کلیك لەسەر OK بکە.



## کارکردن بە Ripple Editing

Ripple Editing شێوازێکی کارکردن لە ڤیدیۆ ئێدیتەر دا کە ڕێگەت پێ ئەدات لە کاتی دانانی کلیپی نوێدا کیپەکانی سەر Timeline بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بجوولێن و بۆشایی بۆ کلیپە نوێکە دروست بکەن.

بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لە سێ شێوازەکەی Ripple Editing:

1. کلیك لەسەر دوگمەکان بکە لە تووڵباڕی Timeline.




2. لە لیستی Edit دا Ripple Editing هەڵبژێرە و کلیك لەسەر یەکێك لە جۆرەکان بکە.




## ڕوونکردنەوەی شێوازەکان:

No Ripple: کلیپی نوێ کورت دەکرێنەوە بۆ ئەوەی لە شوێنی بەتاڵدا جێیان بێتەوە.

Single-Track Ripple: لەکاتی دانانی کلیپی نوێدا هەموو کلیپەکانی تر پاڵ پێوە دەنرێن بۆ دروستکردنی شوێنی گونجاو بۆ کلیپەکە لە هەمان تراکدا.

Multi-Track Ripple: ئیشی هەروەک Single-Track Ripple وایە بەڵام ئەم بابەتی هەموو تراکەکان دەجووڵێنێت نەک تەنها بابەتی یەک تراک.

## دانانی کلیپێک لە ناوەڕاستی کلیپێکی تر

ئەتوانرێت کلیپێك لە ناوەڕاستی کلیپێکی دیکەدا دابنرێت، کلیپی دووەم دوو کەرت ئەبێت.

1. لە لیستی Edit دا Ripple Editing هەڵبژێرە و پاشان کلیك لەسەر Single-Track یان Multi-Track بکە.




2. کلیك لەسەر دوگمەی Insert Video File بکە.




3. لە دایەلۆگ بۆکسی Insert Video دا کلیپێك دیاری بکە بۆ هێنانە ناوەوە.

4. کلیك لەسەر Open بکە.

5. پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ و (بەبێ پەنجە هەڵگرتن) کلیك لەسەر ناوەڕاستی کلیپێکی تر بکە لە Timeline دا.

## کورتکردنەوەی کلیپێکی دەنگ بە بەکارهێنانی ویندۆی Source

1. دەبڵ کلیك لەسەر کلیپێکی دەنگ بکە.




2. ئەو شوێنە بدۆزەرەوە کە ئەتەوێت قرتاندنی لێوە دەست پێ بکەیت بە بەکارهێنانی ئەم لاکێشەیە.




3. کلیك لەسەر شوێنی خوازراو بکە بۆ سەرەتای قرتاندنەکە، هێڵە سوورەکە دەچێتە سەر شوێنەکە.



4. کلیك لەسەر دوگمەی Mark-In بکە.




5. کلیك لەسەر شوێنی کۆتایی قرتاندنەکە بکە، هێڵە سوورەکە دەچێتە سەر شوێنەکە.



6. کلیك لەسەر دوگمەی Mark-Out بکە.




7. کلیك لەسەر دوگمەی Apply بکە.



# بەشی پێنجەم



Repligator's Old Film Effect

# دانانی کاریگەری و تایتڵ

## بەکارهێنانی کاریگەرییەکانی ترانزیشن ( Transition Effects)

بەشێکی گرنگ لە هەر ڤیدیۆ یان فیلمێك بریتییە لە ئەو کاریگەریی ترانزیشنانە کە بەکاردەهێنرێن بۆ جوانکردنی شێوازی پیشاندانی کلیپەکان یەك لە دوای یەك بە تێکەڵ کردن، یان تاریك بوونی کلیپێك و دەرکەوتنی کلیپی دواتر.

### سەرەتاکانی کاریگەریی ترانزیشن

دوای ئەوەی چەند کلیپێك لەسەر تراکێکی ڤیدیۆ دادەنێیت، کلیپەکان یان ناوچەیەکی بەتاڵ لە نێوانیاندایە، یان لە تەنیشت یەکەوەن، یان بەسەر یەکدا دەچن. کاتێك بەسەر یەکدا چوون، کلیپێکی ترانزیشن بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەنێوانیاندا دادەنرێت.

بڕی بەسەریەکداچوونەکە درێژی کاریگەرییەکە دیاری دەکات، هەرکاتێك تۆ دەستکاری بڕی بەسەرداچوونەکە بکەیت بەهۆی جولاندنی کلیپێك ئەوا کاریگەرییەکەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت.




بۆ دیاریکردنی ترانزیشنێك بۆ ئەوەی بۆ هەموو کلیپە بەسەریەکداچووەکانت بەکاربهێنرێت پێویستە لە دایەلۆگ بۆکسی Preferences دا دیاری بکەیت.

1. لە لیستی File دا کلیك لەسەر Preferences بکە.

2. کلیك لەسەر تابی Edit بکە.



3. لە تەنیشت Default transition effect دا کلیك لەسەر دوگمەی Select بکە. دایەلۆگ بۆکسی Production Library دەکرێتەوە.




4. یەکێك لە ترانزیشنەکان هەڵبژێرە.

5. کلیك لەسەر OK بکە.

6. کلیك لەسەر OK بکە.



## دیاریکردنی ترانزیشن بەدەستی خۆت

1. دوو کلیپی ڤیدیۆ لە تراکێکدا نزیک یەك بکەرەوە هەتا بەسەریەکدا دەچن.




2. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Production Library بکە بۆ کردنەوەی ویندۆی Production Library (ئەگەر نەکرابێتەوە).



3. کلیك لەسەر تابی Production Library بکە ئەگەر کلیکی لەسەر نەکراوە.




4. دەبڵ کلیك لەسەر Transition Effect بکە. لیستێك دەکرێتەوە کە ترانزیشنەکانی تێدایە.



5. کلیك لەسەر یەکێك لە شێوازەکان بکە. لە لای ڕاستدا ترانزیشنەکانی ئەو شێوازە پیشان دەدرێن.




6. بڕیار بدە چ ترانزیشنێکت ئەوێت، پاشان ڕای بکێشە بۆسەر ناوچەی هاوبەشی نێوان دوو کلیپەکە (واتە ئەو ناوچەی کە دوو کلیپەکە بەسەریەکدا چوون).




7. ئێستا ئەتوانیت ڤیدیۆکەت تاقی بکەیتەوە بە کلیك کردن لەسەر دوگمەی Play لە ویندۆی Preview دا.

## ڕێکخستنی ترانزیشن

چەند هەڵبژاردنێك هەن لە دایەلۆگ بۆکسی Transition Options دا کە ڕێگەت پێ ئەدەن ترانزیشنەکەت ڕێك بخەیت و دەستکاری بکەیت. ژمارە و جۆری هەڵبژاردنەکان بەپێی ترانزیشن دەگۆڕێت. نموونەکەی خوارەوە باسی دایەلۆگ بۆکسی Transition Options دەکات بۆ ترانزیشنی Box-Wipe.




1. Transition دیاری دەکات چ ڤیدیۆ کلیپێك سەرەتا دەکەوێتە کار.
2. Divide X/Y by شاشەکە دابەش دەکات بەشێوەیەکی ئاسۆیی یان ستوونی بۆ دروستکردنی چەند جارە لە هەمان کاریگەری.
3. Color square ڕەنگ چوارچێوە دیاری دەکات.
4. Border قەبارەی چوارچێوەی دەوری ترانزیشنەکە دیاری دەکات.
5. Soft edge سووچەکانی ترانزیشنەکە نەرم دەکات.
6. دوگمەکانی Direction ئاڕاستەی جووڵانی ترانزیشنەکە دیاری دەکەن.
7. Sample window ترانزیشنەکەت پیشان دەدات.
8. Key Frame Controller دیاری دەکات "کلیلە فرەیم" ەکان دیاری دەکات کە لە ڕێگەیانەوە سیفاتی جیا بۆ کاتی جیاوازی کلیپێك دادەنرێت.
9. Speed control خێرایی ئیشکردن دیاری دەکات.
10. Show background ڤیدیۆ ئەسڵییەکە پیشان دەدات.
11. دوگمەی Preview کاریگەرییەکە پیشان دەدات.
12. Preview Playback Options دایەلۆگ بۆکسێك دەکاتەوە کە تیایدا ئەتوانیت دیاری بکەیت لە کوێدا کاریگەرییەکان تاقی بکەیتەوە.

13. Play in Preview Window or External Monitor ئەنجامەکان پیشان دەدات لە ویندۆی Preview دا یان شاشەیەکی دەرەکی.
14. Transition degree بڕی تەواوبوونی کاتی ترانزیشنەکە دیاری دەکات لە فرەیمی دیاریکراودا.
15. X و Y خانَی دەستپێکردنی ترانزیشنەکە لەسەر ڕووتەختی پۆوتان دیاری دەکەن. (لە کوردیدا بە خانەکانی "س" و "ص" ناسراون)
16. Reverse ئاڕاستەی ترانزیشنەکە هەڵدەگێڕێتەوە.

**بۆ ڕێکخستنی ترانزیشنێک** (لێرەدا ترانزیشنی Box-Wipe وەك نموونە بەکاردێنین):

1. ترانزیشنی Box-Wipe لەنێوان دوو کلیپیدا دابنێ.




2. ترانزیشنەکە دیاری بکە ئەگەر دیاری نەکرابوو، بە کلیك کردن لەسەر چوارچێوەکەی.




3. کلیکی ڕاست لەسەر ترانزیشنەکە بکە و لە لیستەکەدا Transition Options هەڵبژێرە.

4. لە دایەلۆگ بۆکسی Transition Options دا نرخی Divide by X بکە بە 2. ئەمە شاشەکە دەکات بە دوو کەرتەوە بەشێوەیەکی ستوونی بۆ دروستکردنی دوو کاریگەری ترانزیشنی Box-Wipe لەیەک کاتدا.




5. نرخی Border بکە بە 1.



6. ڕەنگی چوارچێوەکە بگۆڕە بە کلیك کردن لەسەر چوارگۆشەی Color و هەڵبژاردنی ڕەنگێك لە دایەلۆگ بۆکسەکەدا.




7. کلیك لەسەر یەکێك لە دوگمەکانی Direction بکە بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی جووڵەی ترانزیشنەکە.



8. نرخی 60 بۆ X و 50 بۆ Y دابنێ. ئەمە خاڵی سەرەتای ترانزیشنەکەیە.




9. کلیك لەسەر OK بکە بۆ داخستنی دایەلۆگ بۆکسەکە و ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکان لەسەر ترانزیشنەکە. تەماشای ترانزیشنە نوێکە بکە.



## خەزنکردنی ترانزیشن

1. ترانزیشنێك ڕێك بخە وەك پێشتر باسمان کرد بۆ ئەوەی بەپێی خواستی تۆ کار بکات.
2. لە دایەلۆگ بۆکسی Transition Options دا کلیك لەسەر Add بکە بۆ ناردنی ترانزیشنە نوێکە بۆ ناو ترانزیشنەکانی تر لە Production Library دا.




3. ناو بۆ ترانزیشنەکەت بنووسە لەگەڵ ڕوونکردنەوەیەك.
4. کلیك لەسەر OK بکە.



## بەکارهێنانی ترانزیشنی Crossfade

یەکێك لە باوترین ترانزیشنەکان لە کاری ڤیدیۆدا بریتییە لە ترانزیشنی Crossfade. بە بەکارهێنانی ئەم ترانزیشنە کۆتایی کلیپێك تاریك دەبێت تا ڕەش دەبێت پاشان ڕەشەکە ڕووناك دەبێت تا کلیپی دواتر دەردەکەوێت.

### بۆ بەکارهێنانی ترانزیشنی Crossfade:

1. کلیپێکی ڤیدیۆ بخەرە سەر تراکی Video1.



2. ئێستا پێویستمان بە کلیپێکی ڕەنگە کە ڕەنگی ڕەش بێت. کلیك لەسەر دوگمەی Color Clip بکە لە تووڵبارِی Timeline دا. دایەلۆگ بۆکسی Insert Color Clip دەکرێتەوە.




3. ڕەنگی ئەم چوارگۆشەیە بکە بە ڕەش ئەگەر ڕەش نییە.



4. کلیك لەسەر دوگمەی Pure Color بکە بۆ ئەوەی کلیپەکە هەمووی ڕەش بێت.




5. کلیك لەسەر OK بکە.




6. ئێستا ئەتوانیت کلیپەکەت دابنێیت، کلیك لەسەر ناوچەیەکی بەتاڵ لە تەنیشت کلیپی یەکەمەوە بکە بۆ دانانی کلیپی ڕەنگەکە.



7. کلیپی ڕەنگەکە ڕابکێشە بە ئاڕاستەی کلیپی یەکەم، تا کەمێك بەسەر یەکدا دەچن. (ئەتوانیت بەپێی پێویست بڕی بەسەریەکداچوونەکە کەم یان زیاد بکەیت)



8. لە Production Library دا، لە فۆڵدەری F/X دا ترانزیشنی Crossfade ڕابکێشە بۆسەر ناوچە بەسەریەکداچووەکەی نێوان دوو کلیپەکە.




9. کلیکی ڕاست لەسەر ترانزیشنەکە بکە و Transition Options هەڵبژێرە.

10. لە دایەلۆگ بۆکسەکەدا دڵنیا بکەرەوە کە لە بەشی Transition دا Forward هەڵبژێرراوە.



11.کلیك لەسەر OK بکە.




12.کلیپێکی ڤیدیۆیی دیکە بهێنەرەوە ناوەوە و لەسەر تراکی Video1 دای بنێ، ئەم کلیپە پێویستـ
برێکی بەسەر کلیپی ڕەنگەکەدا بچێت.

13.لە Production Library دا، لە فۆڵدەری F/X دا ترانزیشنی Crossfade ڕابکێشە بۆسەر ناوچە بەسەریەکداچووەکەی نێوان کلیپی ڕەنگەکە و کلیپە نوێکە.




14.کلیکی ڕاست لەسەر ترانزیشنی دووەم بکە و Transition Options هەڵبژێرە.

15. دڵنیا بکەرەوە لەوەی لێرەدا Backward هەڵبژێرراوە.



16.کلیك لەسەر OK بکە.



## ترانزیشنی Flashback

ئەتوانیت ترانزیشنی Flashback بەکاربێنیت بۆ دروستکردنی دیمەنی خەونێك. تیشك بۆ فرەیمەکان دادەنرێت بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی وەك خەونی پێ ببخەشێت.









## بەکارهێنانی کۆنترۆڵەکانی Key Frame

فرەیمی کلیل بریتین لە هەندێ فرەیم لە کلیپێکدا کە تیایاندا ئەتوانیت سیفاتی جیا بۆ کاریگەرییەك دیاری بکەیت، بۆ نموونە ئەتوانیت لە چرکەی یەکدا ترانزیشنێك شێوەیەکی هەبێت و لە چرکەی سێ دا هەمان ترانزیشن شێوەکەی بگۆڕێت بەهۆی گۆڕینی سیفاتەکانی لە فرەیمێکی کلیلدا. وەکو نموونەیەك هەنگاوەکانی خوارەوە پیشانت ئەدەن چۆن دایەلۆگ بۆکسی ترانزیشنی Circle-Wipe بەکاربێنیت بۆ دروستکردنی ترانزیشنێك کە فرەیمی کلیلی تێدابێت.

1. دوو کلیپ لە تەنیشت یەکەوە دابنێ هەتا بەسەریەکدا دەچەن.
2. لە فۆڵدەری Wipe ی Production Library دا ترانزیشنی Circle-Wipe ڕابکێشە بۆسەر ناوچەی نێوان دوو کلیپەکە.
3. کلیکی ڕاست لەسەر ترانزیشنەکە بکە و Transition Options هەڵبژێرە.
4. لە دایەلۆگ بۆکسی Transition Options دا دیارخەری Key frame Controller بجووڵێنە بۆ یەك لەسەر سێی ماوەکەی.



5. کلیك لەسەر دوگمەی Add Key frame بکە.




6. دیارخەری Transition degree بکە بە 75٪.



7. دیارخەی Key frame Controller بجوولێنە بۆ دوو لەسەر سێی ماوەکە.




8. کلیك لەسەر دوگمەی Add Key frame بکە.



9. دیارخەری Transition degree بکە بە 25%.




10. کلیك لەسەر OK بکە و تەماشای ئەنجامەکە بکە.



## ئۆڤەرلەی Overlay

دانانی نووسین لەسەر ڤیدیۆ سادەترین نموونەی ئۆڤەرلەیە. ئۆڤەرلەی ئەکرێت وێنەش بێت، بۆ نموونە وێنەیەك کە لە تەنیشت شانی خوێنەری هەواڵەکانەوە پیشان دەدرێت.

### بۆ دروستکردنی ئۆڤەرلەیەکی ڕەنگ:

1. کلیپێکی ڤیدیۆ لەسەر تراکی Video2 دابنێ.




2. کلیپێکی ڤیدیۆی دیکە لەسەر تراکی Video1 لەژێر کلیپەکەی پێشوودا دابنێ.



3. کلیکی ڕاست لەسەر کلیپی یەکەم بکە (کلیپی سەر تراکی Video2) و لە لیستەکەدا Overlay Options هەڵبژێرە. دایەلۆگ بۆکسی Overlay Options دەکرێتەوە.




4. لە لیستی Type دا Color Key هەڵبژێرە.




5. کلیك لەسەر ئەم چوارگۆشەیە بکە، دایەلۆگ بۆکسی Ulead Color Picke دەکرێتەوە.



6. **کلیك لەسەر ڕەنگێك بکە** بۆ ئەوەی بە بێ ڕەنگ دەربکەوێت، **بۆ ئەوەی ڕێگە بدات بە کلیپەکەی تر لە ناوچە بێڕەنگەکدا** خۆی پیشان بدات. بۆ نموونە **ئەتوانیت ڕەنگی ڕەش هەڵبژێریت کە لە ڤیدیۆدا ڕەنگێکی باوە.**




7. **کلیك لەسەر** OK بکە.



8. دیارخەری Similarity دیاری دەکات کە چ ڕەنگێك بە بیّ ڕەنگ دەربکەوێت. هەتا نرخی ئەم دیارخەرە زیاتربێت، ڕەنگەکانی دراوسێی ئەو ڕەنگەی کە لە هەنگاوی (5) دا دیاریت کرد بە بیّ ڕەنگ دەردەکەون، بە ووتەیەکی تر، هەتا ئەم دیارخەرە زیاتربێت کلیپی سەر تراکی Video2 ناوچەی بیّ ڕەنگ تیایدا زیاتر دەبێت.




9. کلیك لەسەر OK بکە بۆ داخستنی دایەلۆگ بۆکسەکە و تەماشاکردنی کاریگەرییەکە.



## دانانی ڤیدیۆ فیلتەر لەسەر کلیپەکان

میدیا ستودیۆ ڤیدیۆ ئێدیتەر ژمارەیەکی زۆر کاریگەری تایبەت و فیلتەری تێدایە کە ڕێگەت پێ ئەدەن کلیپە ڤیدیۆییەکانت جوانتر بکەیت و پەرە پێبدەیت.

## بۆ دانانی ڤیدیۆ فیلتەرێک لەسەر کلیپێک:

1. ئەگەر Production Library نەکراوەتەوە لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Production Library بکە.


1
Video Editor - Ulead.dvp *
File Project Edit View Capture Search Insert Clip Window Help Switch
Preview - Main Timeline Instant Play
Source
Preview - Main Timeline Instant Play
Standard Toolbar
Production Library
Source Window
Preview Window
Trim Window
Audio Mixing Panel
Quick Command Panel
Status Bar
Effects Manager
Panel Manager
Summary Timeline
Float Timeline
Layout Manager...
0:00:08.21
0:05:38.00
Main Timeline
Audio1
Show or hide the Production Library

2. لە Production Library دا کلیك لەسەر تابی Production Library بکە.




3. دەبڵ کلیك لەسەر Video Filter بکە.




4. کلیك لەسەر یەکێك لە شێوازەکان بکە. ئەگەر کلیك لەسەر All بکەیت بابەتی هەموو شێوازەکانی ترت پیشان دەدرێت.



5. لە لای ڕاستدا کلیك لەسەر فیلتەرێك بکە. فیلتەرەکە ڕابکێشە بۆسەر کلیپەکەت.



## ڕێکخستنی ڤیدیۆ فیلتەر

1. کلیکی ڕاست لەسەر کلیپێك بکە کە ڤیدیۆ فیلتەری لەسەر دانرابێت. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Video Filters بکە. دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دەکرێتەوە.



2. کلیك لەسەر دوگمەی Options بکە بۆ پیشاندانی فیلتەرەکە و گۆڕینی سیفاتەکانی.




3. کە دایەلۆگ بۆکسەکە دەکرێتەوە کە دوو ویندۆ پیشان دەدات، Original (ئەسڵیی) لەگەڵ Preview (دوای دانانی فیلتەرەکە، واتە کاری فیلتەرەکەت پیشان دەدات).



4. دەستکاری سیفاتەکان بکە بە خواستی خۆت. بۆ پیشاندانی کاریگەری ئەو گۆڕانکاریانەی کە ئەنجامیان دەدەیت، کلیك لەسەر دوگمەی Play Preview بکە.




5. دوای ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکانت کلیك لەسەر OK بکە.



6. لە دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دا کلیك لەسەر OK بکە.



## سڕینەوەی ڤیدیۆ فیلتەر

1. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Video Filters بکە.




2. لە لیستی Applied filters دا کلیك لەسەر ئەو فیلتەرە بکە کە ئەتەوێت بیسڕیتەوە.



3. کلیك لەسەر Remove بکە.




4. کلیك لەسەر OK بکە.



## ئامرازی ڕاستکردنەوەی ڕووناکی

ڕاستکردنەوەی ڕووناکی (Enhance Lighting) ڤیدیۆ فیلتەرێکە بەکاردەهێنرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی بڕی بەرکەوتنی ڕووناکی (exposure) لە ڤیدیۆی تاریك (underexposed) یان زۆر ڕووناك (overexposed).

### بۆ بەکارهێنانی فیلتەری ڕاستکردنەوەی ڕووناکی:

1. لە Timeline دا کلیپێك دیاری بکە کە ئەتەوێت فیلتەرەکەی لەسەر دابنێیت.




2. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Video Filters بکە.



3. لە دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دا، لە لیستی Available filters دا کلیك لەسەر Enhance Lighting بکە.




4. کلیك لەسەر Add بکە.



5. کلیك لەسەر Options بکە. دایەلۆگ بۆکسی Enhance Lighting دەکرێتەوە.




6. لێرەدا ئەتوانیت گۆڕانکاری لە دوو نرخدا بکەیت. Fill light ڕووناکی بۆ ناوچە تاریکترەکانی ڤیدیۆکە دادەنێت بۆ باشترکردنی دیمەنی ڤیدیۆکە.



7. Enhance shadow ناوچە سێبەرەکان باشتر دەکات لە ئەو ناوچانەدا کە ڕووناکیان زۆرترە لە ئاستی ئاسایی.




8. کلیک لەسەر OK بکە.



## ڕاستکردنەوەی ڕەنگ

ـنچینەی ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بریتییە لە ڕێکخستنی ناوچەی ڕووناك، نیمچە ڕووناك و سێبەرەکان لە کەناڵەکانی سوور و سەوز و شینی وێنە دیجیتاڵی یان ڤیدیۆکانت.

ـاتای ئەمەش ئەوەیە کە تۆ پێویست دەکات بە ووردی بڕی هەریەك لە ڕەنگەکان دیاری بکەیت لە ناوچەی ـووناك، نیمچە ڕووناك و سێبەرەکاندا. ئەتوانیت بۆ ئەم پرۆسەیە پشت بە پرۆگرامەکە خۆی ببەستیت و ـاستکردنەوەیەکی ئۆتۆماتیك بۆ ڕەنگەکان ئەنجام بدەیت، ئەشتوانیت خۆت هەر یەکە لە ڕەنگەکان ڕێك بخەیت.

ـێ ڕێگەی جیاواز هەن بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەنگ: ڕێکخستنی ئاستەکانی ڕەنگی ڕەش بۆ سپی (Levels)، کارکردن لەگەڵ Hue، Saturation و Lightness (HSL)، لەگەڵ دەستکاریکردنی چەماوەکانی ڕەنگ (Curves).

### بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بە بەکارهێنانی Levels:

1. لە Timeline دا کلیك لەسەر کلیپێك بکە کە ئەتەوێت ڕاستکردنەوەی ڕەنگی لەسەر ئەنجام بدەیت.
2. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Video Filters بکە.
3. لە دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دا لە لیستی Available filters دا کلیك لەسەر Color Correction بکە.




4. کلیك لەسەر Add بکە.




5. کلیك لەسەر Options بکە.



6. لە دایەلۆگ بۆکسی Color Correction Tool دا کلیك لەسەر تابی Level بکە (ئەگەر کلیکی لەسەر نەکراوە).




7. کلیك لەسەر دوگمەی Master بکە (ئەگەر کلیکی لەسەر نەکراوە). ئەم دوگمەیە گۆڕانکارییەکانت والێدەکات کە بەسەر هەموو ناوچە ڕووناك، نیمچە ڕووناك و تاریکەکاندا ئەنجام بدرێن، لە جیاتی ئەوەی بەسەر یەك ناوچەی دیاریکراودا.




8. کلیك لەسەر ئەم دوگمەیە بکە. ئەم دوگمەیە وا لە گۆڕانکارییەکانت دەکات بەسەر هەموو ڕەنگەکاندا ئەنجام بدرێن نەك تەنها ڕەنگێکی دیاری کراو.




9. گۆڕانکاری لەم سێ دیارخەرەدا بکە و لە ویندۆی Preview دا تەماشای ئەنجامی گۆڕانکارییەکان بکە. ئەگەر ئەتەوێت تەماشای ئەنجامی گۆڕانکارییەکان بکەیت لە ناوچەیەکی دیکەی ڤیدیۆکەتدا (نەك لە سەرەتای ڤیدیۆکەدا)، پێویستە فرەیمی کلیل بەکاربێنیت کە لە پێشتر لەم کتێبەدا باسمان لێ کرد.

10. بۆ دەستکاریکردنی هەر یەك لە ناوچەی ڕووناك، نیمچە ڕووناك و تاریکەکان بە جیا، کلیك لەسەر دوگمەکانیان بکە لێرەدا و پاشان هەنگاوی (9) دووبارە بکەرەوە.




11.کلیك لەسەر OK بکە.



## راستکردنەوەی ڕەنگ بە بەکارهێنانی HSL

لەجیاتی بەکارهێنانی Levels، ئەتوانیت HSL بەکاربێنیت، کە کۆنترۆڵکی ڕاستەوخۆت پێدەبەخشێت بەسەر ڕەنگەکاندا. HSL لە سێ بەش پێکهاتووە:

Hue: مەبەست جۆری ڕەنگە.

Saturation: مەبەست بڕی ڕەنگە.

Luminance: دیاری دەکات ڤیدیۆکەت چەند ڕووناك بێت.

## بۆ بەکارهێنانی HSL:

1. لە دایەلۆگ بۆکسی Color Correction (کە لە بابەتی پێشوودا باسمان کرد) دا کلیك لەسەر تابی HSL بکە.



2. ئەم دیارخەرانە بەکاربێنە بۆ گۆڕینی نرخەکان.




- Hue shift ڕەنگەکە دەگۆڕێت بەشێوەیەکی هاوڕێژە بەدرێژی ڕەنگەکانی شەبەنگ (spectrum) دا.
- Gamma ژمارەی گشتی ڕەنگەکان دیاری دەکات.
- Gain ڕەنگەکان بەهێز دەکات.
- Saturation تۆخی ڕەنگەکان دیاری دەکات.
- Contrast بڕی جیاوازی نێوان ڕەنگەکانی ناوچە تۆخ و کاڵەکانی ڤیدیۆکە دیاری دەکات.
- Luminance ڕووناکی گشتیی ڤیدیۆکە دیاری دەکات.

## ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بە بەکارهێنانی چەماوەکان (Curves)

ڕێگای سێیەم بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بریتییە لە بەکارهێنانی چەماوەکان.

### بۆ بەکارهێنانی چەماوەکان:

1. لە دایەلۆگ بۆکسی Color Correction Tool دا کلیك لەسەر تابی Curves بکە.



2. کلیك لەسەر یەکێك لە ڕەنگەکان بکە لێرەدا بۆ کارکردن لەسەریان.




3. یان کلیك لەسەر دوگمەی Master بکە بۆ کارکردن لەسەر هەموو ڕەنگەکان پێکەوە.



4. لێرەدا بە کلیك کردن و ڕاکێشانی ماوس چەماوەکانت دروست بکە.




5. کلیك لەسەر OK بکە.

## ڕێگەیەکی دیکە بۆ سڕینەوەی فیلتەرەکان

1. کلیك لەسەر ئەو کلیپە بکە کە ئەتەوێت فیلتەرەکەی لەسەر لاببەیت.
2. لە Effects Manager دا کلیك لەسەر ئەو فلتەر بکە کە ئەتەوێت بیسڕیتەوە.




3. کلیکی ڕاست لەسەر فیلتەرەکە بکە و Delete an effect هەڵبژێرە.



## فیلتەرە گشتگیرەکان (Global filters)

فیلتەرە گشتگیرەکان ڕێگەت پێ ئەدەن ژمارەیەك ڤیدیۆ فیلتەر بۆ هەموو پرۆژەکەت دابنێیت (نەك تەنها بۆ یەك کلیپ).

### بۆ بەکارهێنانی فیلتەرە گشتگیرەکان:

1. لە لیستی Project دا کلیك لەسەر Project Settings بکە.



2. لە دایەلۆگ بۆکسی Project Settings دا کلیك لەسەر دوگمەی Global Filters بکە.




3. لە دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دا لە لیستی Available filters دا کلیك لەسەر فیلتەرێك بکە.



4. کلیك لەسەر Add بکە.




5. هەنگاوی (3) و (4) بۆ ئەو فیلتەرانەی دیکە بەکاربێنە کە ئەتەوێت دایان بنێیت.

6. کلیك لەسەر OK بکە.



## دانانی جووڵە بۆ کلیپەکان

یەکێك لە توانا پێشکەوتووەکانی میدیا ستودیۆ بریتییە لە دیاریکردنی ڕێگەیەك بۆ جوولانی کلیپەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری شاشەکە. ئەتوانیت جووڵە لەسەر هەرکلیپێك کە بتەوێت دابنێیت، بە زۆریش لەگەڵ کلیپەکانی تایتڵ و وێنەی وەستاو و وێنەی یەك لەدوای یەك بەکاردێت.

### بۆ دروستکردنی جووڵەیەکی 2D:

1. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Production Library بکە بۆ کردنەوەی ویندۆی Production Library.



2. کلیك لەسەر تابی Production Library بکە.




3. دەبڵ کلیك لەسەر Moving Path بکە.



4. کلیك لەسەر 2D Basic بکە.




5. کلیك لەسەر 2D Basic بکە و ڕای بکێشە بۆ سەر کلیپەکەت.

6. کلیك لەسەر Close بکە بۆ داخستنی ویندۆی Production Library.




7. لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Effects Manager بکە بۆ کردنەوەی ویندۆی Effects Manager.




8. لە لای چەپدا کلیك لەسەر 2D Basic Moving Path بکە.



9. ئەم لاكێشەيە شاشەی ڤیدیۆكەت پیشان دەدات.




10.كلیك لەسەر خاڵی دەستپێكردنی جووڵەی كلیپەكە (S) بكە و ڕای بكێشە بۆ ئەو شوێنەی شاشەكە كە ئەتەوێت كلیپەكە جووڵەكەی لێوە دەست پێ بكات.



11. کلیك لەسەر خاڵی کۆتایی جووڵەی کلیپەکە (E) بکە و ڕای بکێشە بۆ ئەوشوێنەی شاشەکە کە ئەتەوێت کلیپەکە جووڵەکەی تێدا کۆتایی پێ بێنێت.




12. کلیك لەسەر Play بکە بۆ تەماشا کردنی ئەنجامەکە (لە ویندۆی Preview دا).



13. ئەگەر ئەتەوێت کلیپەکە جووڵەکەی لەسەرەتای کلیپەکەوە تا کۆتایی کلیپەکە نەبێت، واتە هەر لە چرکەی یەکەم یان دووەم کلیپەکەدا تەواو بێت و کلیپەکە دواتر بە ئاسایی کار بکات، ئەم دیارخەرە بجووڵێنە بۆ ئەو شوێنەی ئەتەوێت جووڵەکە کۆتایی پێ بێت، پاشان:




14. کلیک لەسەر Add key frame بکە.



15. خانَی S بجوولَێنە بۆسەر چەقی خانَی E.







16.ئێستا جوولَەی کلیپەکە لە سەرتای ئیشکردنی کلیپەکەوە تەواو دەبێت.

## دایەلۆگ بۆکسی Moving Path

ئەم دایەلۆگ بۆکسەکدا گۆڕانکاری لە سیفاتی جووڵەی کلیپەکاندا دەکەیت، سەرەتا باسی چۆنێتی کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسەکە دەکەین، پاشان دایەلۆگ بۆکسەکە ڕوون دەکەینەوە.

## کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسی Moving Path

1. کلیك لەسەر کلیپەکەت بکە
2. لە لیستی Clip دا کلیك لەسەر Moving Path Options بکە.




## ڕوونکردنەوەی دایەلۆگ بۆکسی Moving Path

1. Motion Control Window (ویندۆی کۆنترۆڵکردنی جووڵە) ڕێگەت پێ ئەدات کۆنترۆڵی ڕێگەی جووڵەی کلیپەکە بکەیت.
2. Key frame Controller (کۆنترۆڵی فرەیمی کلیل) ڕێگەت پێ ئەدات کۆنترۆڵی فرەیمی کلیلەکان بکەیت و فرەیمی کلیلی نوێ دابنێیت.
3. Zoom ویندۆی zoom دەکاتەوە کە ویندۆی ژمارە (1) بە گەورەکراوی پیشان ئەدات.
4. Restore قەبارەی کلیپەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ قەبارەی ئەسڵی.
5. Actual Image وێنەی کلیپەکە لە ویندۆی ژمارە (1) دا پیشان دەدات لەجیاتی لاکێشەکان.
6. بۆکسەکانی Width و Height درێژی و بەرزی کلیپەکە دیاری دەکەن.
7. Keep aspect ration کاتێك ئیشارەت لەم بۆکسە درابێت بەرزی و پانیی کلیپەکە بەشێوەیەکی هاوڕێژە دەگۆڕێن، واتە کاتێك درێژی زیاد دەکەیت بەرزییش زیاد دەبێت، بۆ ئەوەی شێوەی کلیپەکە وەك خۆی بمێنێتەوە.




8. Interpolate frame size with logarithm چەند کێشەیەك چارەسەر دەکات کە بەهۆی گۆڕانی قەبارەی کلیپەکە و جووڵەوە دروست دەبێت.
9. Preview ڕێگەت پێ ئەدات جووڵەکە ببینیت.
10. Show Background ئەگەر کلیپێك لە پشت ئەم کلیپەوە هەبێت ئەوا لێرەدا ئەویش پیشان دەدرێت (بۆ نموونە کاتێك جووڵە بۆ کلیپی سەر تراکی Video2 دادەنێیت و کلیپێکی دیکەت لە Video1 دا هەیە).
11. Speed خێرایی پیشاندانی جووڵەکە لە ویندۆی (9) دا دیاری دەکات.
12. Play جووڵەکە دەخاتە کار بۆ تاقیکردنەوە.
13. Preview Playback Options دایەلۆگ بۆکسێك دەکاتەوە کە ڕێگەت پێ ئەدات دیاری بکەیت لە کوێدا تەماشای تاقیکردنەوەی جووڵەکەت بکەیت.
14. External Monitor تاقیکردنەوەکەت لە شاشەیەکی دەرەکیدا پیشان ئەدات (بۆ هەندێ کۆمپیوتەری تایبەت).
15. Title Safe Area چوارچێوەی ئەو ناوچەیەت پیشان ئەدات کە لە شاشەی تەلەفزیۆندا دەردەکەوێت. واتە ئەگەر کلیپەکە لە دەرەوەی ئەم ناوچەیە بوو لە شاشەی تەلەفزیۆندا دەرناکەوێت.
16. بۆکسی Reference point ڕێگەت پێ ئەدات بە خێرایی شوێنی کلیپەکە بگۆڕێت بۆ دانانی جووڵە.
17. X و Y ڕێگەت پێ ئەدەن بە نووسینی ژمارە شوێنی کلیپەکە دیاری بکەیت.

## دروستکردنی جووڵە لە ڕێگەی ویندۆی Preview

1. کلیپێك دیاری بکە بۆ دانانی جووڵە لەسەری.
2. لە Production Library دا، لە فۆڵدەری Moving Path دا 2D Basic ڕابکێشە بۆسەر کلیپەکە. (لە بابەتی پێشوودا بە درێژی باسکرا)




3. Effects Manager بکەرەوە. (Production Library دابخە بۆ بوونی شوێنی زیاتر بۆ کارکردن.)



4. کلیك لەسەر خاڵی دەستپێکردنی جووڵە (S) بکە لە ویندۆی Motion Control لە Effects Manager دا.




5. لە ویندۆی Preview دا کلیپەکە ڕابکێشە بۆ ئەو شوێنەی ئەتەوێت جووڵەکەی لێوە دەست پێ بکات.



6. کلیك لەسەر خاڵی کۆتایی جووڵە (E) بکە لە ویندۆی Motion Control لە Effects Manager دا.




7. لە ویندۆی Preview دا کلیپەکە ڕابکێشە بۆ ئەو شوێنەی ئەتەوێت جووڵەکەی تێدا کۆتایی پێ بێنێت.



8. کلیك لەسەر Play بکە بۆ تەماشاکردنی ئەنجامەکە.



## بەکارهێنانی Moving Path (جووڵە) بۆ دروستکردنی کاریگەری پێشکەوتوو

یەکێك لە بەکارهێنانی فراوانەکانی جووڵەی 2D Basic بریتییە لە دانانی کلیپ لە شوێنێکی وەستاودا لەناو کلیپێکی تردا. تۆ ئەم کاریگەرییە لە بەرنامەی تەلەفزیۆنی، ڕیکلام و هەواڵەکاندا بە زۆری دەبینیت. ئەم کاریگەرییە هەرچەندە شتێکی زۆر جوان و پێشکەوتووە، لە میدیا ستودیۆدا بە ئاسانی ئەنجام دەدرێت.



1. کلیپێك لەسەر تراکی Video1 دابنێ. ئەم کلیپە ئەبێت بە کلیپی پشتەوە.



2. کلیپێك لەسەر تراکی Video2 دابنێ، ئەم کلیپە لەسەر کلیپی یەکەم دەردەکەوێت.




3. جووڵەی 2D Basic لەسەر کلیپی ناو تراکی Video2 دابنێ. Production Library دابخە.

4. Effects Manager بکەرەوە.




5. کلیك لەسەر خاڵی دەستپێکردنی جووڵە (S) بکە لە ویندۆی Motion control دا.



6. کلیك لەسەر بۆکسی Keep aspect ratio بکە بۆ ئیشارەت دان لە بۆکسەکە.




7. نرخی Width بگۆڕە بۆ 200 (بەرزییەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەگۆڕێت).



8. نرخی X بکە بە 550، نرخی Y بکە بە 220. (ئەم نرخانە کلیپەکە دەجووڵێنێت بۆ سەرەوەی لای ڕاست، ئەکرێت بەهۆی جیاوازی قەبارەی شاشەی کلیپەکانەوە ئەم ژمارانە بۆ هەندێك کلیپ کار نەکەن، واتە کلیپەکان بجووڵێنن بۆ شوێنێکی دیکە وەك ناوەڕاستی شاشەکە، لەم حاڵەتەدا خۆتی خاڵی دەستپێکردنەکە بجووڵێنە بۆ شوێنی خوازراو.)




9. کلیك لەسەر خاڵی کۆنترۆڵی کۆتایی (E) بکە.



10.هەمان نرخەکانی هەنگاوی (7) و (8) داخڵ بکە. (واتە بۆ بەرزی و پانی و بۆ X و Y)




11. تەماشای ئەنجامی کارەکەت بکە.



## جووڵەی 2D ی پێشکەوتوو 2D Advanced Moving Path

جیاوازی 2D Advanced لەگەڵ 2D Basic ئەوەیە کە لە Advanced ئەتوانیت کلیپکە بسووڕێنیتەوە

1. لە Production Library دا کلیك لەسەر 2D Advanced بکە.




2. جووڵەی 2D Advanced ڕابکێشە بۆ سەر کلیپەکەت.

3. لە Effects Manager دا کلیك لەسەر خانی سەرەتای جووڵە (S) بکە.




4. نرخێك بۆ سووڕانەوەی کلیپەکە دیاری بکە، یاخود بە ماوسەکە کۆنترۆڵی سووڕانەوەکە ڕابکێشە. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت کلیپەکە لەسەرەتاوە دەست بە سووڕانەوە بکات و تا کۆتایی کلیپەکە یەك سووڕی تەواو بدات، پێویستە لێرەدا سفر داخڵ بکەین.



5. کلیك لەسەر خاڵی کۆتایی جوڵە (E) بکە.




6. ئەتوانیت کلیك لەسەر ئەم دوو دوگمەیە بکەیت بەکارهێنانی ویندۆی Motion control بۆ بەکارهێنانی خاڵەکانی S و E، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە خاڵی سەرەتا و کۆتایی بەسەر یەکەوە بن.



7. ئەگەر بمانەوێت سوورە تەواوەکەی هەنگاوی (4) بەدی بێنین پێویستە لێرەدا 360 داخڵ بکەین. ئەگەر ئەتەوێت سووڕی زیاتر یان کەمترت دەست بکەوێت ئەوا گۆشەی سووڕانەوەی دیکە بەکاربێنە (واتە ژمارەی کەمتر یان زیاتر لە 360). ئەگەر ئەتەوێت کلیپەکە تا نیوەی کلیپەکە بە ئاڕاستەیەك بسووڕێتەوە و دای ئەوە بە ئاڕاستەی پێچەوانە، پێویستە فرەیمی کلیل بەکاربێنیت.




8. کلیك لەسەر Play بکە بۆ تەماشاکردنی ئەنجامی کارەکەت.



## دانانی جووڵەی سێ دووری 3D

1. لە Production Library دا کلیك لەسەر تابی Production Library بکە.




2. کلیك لەسەر یەکێك لە فۆڵدەرەکانی 3D، Cylinder یان Sphere بکە.



3. تەماشای جووڵەکان بکە، ئەو جووڵەیەی بە دڵتە ڕابکێشە بۆ سەر کلیپەکەت.



## بەکارهێنانی فرەیمی کلیل لەگەڵ جووڵەدا

هەرچەندە پێشتر باسی فرەیمی کلیلمان کردووە بە گشتی، ئێستا باسی فرەیمی کلیل دەکەین و چۆنێتی بەکارهێنانی لەگەڵ جووڵەدا، ئەگەر پێشتر کاری زۆرت لەگەڵ فرەیمی کلیلی ئاساییدا کردبێت (واتە لەگەڵ خوێندنەوەی بابەتەکانی پێش جووڵەدا) ئەوا پێویستت بەم بابەتەی ئێستا نابێت. بەڵام ئەگەر کەسێکت کە لە بە تەواوەتی لە کار و سوودی فرەیمی کلیل تێ نەگەیشتوویت ئەوا ئەم بابەتە سوودی بۆت دەبێت.

## بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاراستی جووڵە بە بەکارهێنانی فرەیمی کلیل

1. جووڵەی 2D Basic لەسەر کلیپێکی ڤیدیۆ دابنێ.
2. کلیکی ڕاست لەسەر کلیپەکە بکە و Moving Path هەڵبژێرە.



3. خاڵی دەستپێکردنی جووڵە (S) ڕابکێشە بۆ سووچی چەپی سەرەوەی شاشەکە.




4. دیارخەری Preview ڕابکێشە بۆ نیوەی ماوەی کلیپەکە.



5. کلیك لەسەر دوگمەی Add Key frame بکە.




6. خاڵی کۆنترۆڵکردنە نوێکە (خاڵێکی کۆنترۆڵی نوێ دروست دەبێت لەگەڵ S و E دا لە کاتی دانانی فرەیمی کلیلدا) ڕابکێشە بۆ خوارەوەی شاشەکە.



7. خاڵی جووڵەی کۆتایی (E) ڕابکێشە بۆ سووچی ڕاستی سەرەوەی شاشەکە.




8. ئێستا ڤیدیۆکەت بەم شێوەیە کار دەکات:



## دروستکردنی تایتڵ

1. کلیپێك لەسەر تراکی Video1 دابنێ. ئەم کلیپە دەبێتە باکگراوندی تایتڵەکە.
2. لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر Insert Title Clip بکە.



3. دەبڵ کلیك لەسەر ناوچەی نووسین بکە لە لای ڕاستی سەرەوەی دایەلۆگ بۆکسەکە.

4. لە بۆکسی Title text دا نووسینەکەت بنووسە.



5. سیفاتەکانی لای چەپی دایەلۆگ بۆکسە بگۆڕە بۆ گۆڕینی دیمەنی تایتڵەکە بە ویستی خۆت.




6. لە تابی Text Style دا ئەتوانیت دیمەنێکی ئامادەکراو بۆ نووسینەکەت دیاری بکەیت. کلیك لەسەر یەکێك لە دیمەنەکان بکە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ نووسینەکەت بگۆڕێت بۆ ئەو دیمەنە.

7. Anti-aliasing هەڵبژێرە بۆ نووسینی ساف.



8. کلیك لەسەر تابی Animation بکە بۆ دانانی جووڵە بۆ تایتڵەکەت. کلیك لەسەر ئەو جووڵەیە بکە کە بەدڵتە.



9. ئەتوانیت کاریگەری تایبەتی وەك بەفر، ئاگر، شووشە و کانزا بۆ نووسینەکەت لە تابی Type Effect دا دابنێیت. کلیك لەسەر یەکێك لە کاریگەرییەکان بکە.



10.کلیك لەسەر OK بکە بۆ دانانی کلیپی تایتڵەکە لە تراکی Video2 دا.




11.کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە تراکی Video2 دا بۆ دانانی کلیپی تایتڵەکە. دواتر ئەتوانیت کلیپەکە بەپێی ویستی خۆت درێژ یان کورت بکەیتەوە بە ڕاکێشانی سنوورەکانی لای چەپ و ڕاستی.

## دروستکردنی فایلێکی ڤیدیۆ

دوای ئەوەی تەواو بوویت لە ئەنجامدانی گۆڕانکاری و ڤیدیۆکەت لە تەماشاکردنی تاقیکردنەوەدا جوانە، کاتی ئەوە هاتووە بەرهەمی کۆتایی پرۆژەکەت دروست بکەیت. پێویستە شێوازێکی ڤیدیۆ هەڵبژێریت کە بگونجێت لەگەڵ مەبەستی بەکارهێنانی ڤیدیۆکە، بۆ نموونە ئایا ڤیدیۆکە تەنها لە کۆمپیوتەردا کاری پێ دەکرێت یان ئەتەوێت لە VCD یش دا کار بکات؟

### بۆ دروستکردنی فایلێکی ڤیدیۆ:

1. لە لیستی File دا ماوسەکەت لەسەر Create بوەستێنە و Video File هەڵبژێرە. دایەلۆگ بۆکسی Create Video File دەکرێتەوە.



2. لە لیستی Save in دا شوێنێك هەڵبژێرە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت بۆ خەزنکردنی فایلەکە.




3. ناوێك بۆ فایلەکە بنووسە لە بۆکسی File name دا.



4. لە لیستی Save as type دا جۆری فایلەکەت دیاری بکە، AVI بێت یان MPEG، MOV (فایلی QuickTime) ، RM (فایلی RealPlayer) هتد.




5. کلیك لەسەر Options بکە بۆ کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسی Video Save Options.



6. کارکردن لەسەر ئەم دایەلۆگ بۆکسە پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، لەبەر ئەمە دواتر بە درێژی باسی دەکەین. دوای ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە دایەلۆگ بۆکسەکەدا کلیك لەسەر OK بکە.




7. کلیك لەسەر Save بکە.



8. چاوەڕی بکە بۆ بەرهەمهێنانی ڤیدیۆکەت. ئەگەر ویستت پرۆسەی بەرهەمهێنانەکە بووەستێنیت، پەنجە بە کلیلی Esc ی کیبۆردەکەت بنێ. پرۆسەکە کۆتایی پێ دێت بەڵام فایلە ڤیدیۆییەکە دروست دەبێت و تەنها ئەو بەشەی پرۆژەکەتی تێدایە کە بەرهەمهێنراوە.



## دروستکردنی فایلی MPEG-1 و MPEG-2

MPEG (ئێمپێگ) یەکێکە لە باشترین ڕێگەکان بۆ خەزنکرن و بلاۆکردنەوەی فایل بۆ کۆمپیوتەر.

### بۆ دروستکردنی فایلێکی MPEG-1 یان MPEG-2:

1. لە لیستی File دا ماوسەکە لەسەر Create بووەستێنە و کلیك لەسەر Video File بکە.
2. لە لیستی Save as type دا MPEG Files (*.mpg) هەلبژێرە.



3. کلیك لەسەر دوگمەی Options بکە.




4. کلیك لەسەر تابی Compression بکە.



5. لە لیستی Media type دا جۆری MPEG ەکە دیاری بکە. ئەگەر فایلی ڤیدیۆکەت بۆ بەکارهێنانی سەر کۆمپیوتەر ئەوێت MPEG-2 هەڵبژێرە. ئەگەر ئەتەوێت لەسەر ڤیدیۆسیدی VCD کاربکات (واتە ئامادەبێت بۆ ئەوەی دواتر بە پرۆگرامی Nero بۆ نموونە بیخەیتە سەر CD بۆ ئەوەی لەسەر VCD کاربکات) PAL VCD هەڵبژێرە. بۆ DVD یش PAL DVD هەڵبژێرە.




6. کلیك لەسەر OK بکە.




7. کلیك لەسەر Save بکە.



## دریژەی دایەلۆگ بۆکسی Video Save Options

لێرەدا باسی گرنگترین هەڵبژاردنەکانی ناو ئەم دایەلۆگ بۆکسە ئەکەین.

## تابی Video Editor




Entire project: فایلێکی ڤیدیۆ دروست دەکات کە هەموو پرۆژەکەی لەخۆ گرتووە. بەڵام Preview range فایلێکی ڤیدیۆیی دروست دەکات بەپێی ئەو ماوەیەی کلیپەکە کە پێشتر لە ویندۆی Preview دا دیاریت کردووە. ئەگەر پێشتر هیچت دیاری نەکردبێت هەڵبژاردنی دووەم کار ناکات.

Perform non-square pixel rendering: ئیشارەت لەم هەڵبژاردنە بدە ئەگەر ئەتەوێت دواتر ڤیدیۆکەت لە تەلەفزیۆندا پیشان بدەیت. ئەگەر ڤیدیۆکەت تەنها بۆ کۆمپیوتەر ئەوێت ئیشارەتی لێ مەدە.

Play after creating: ڤیدیۆکە دەکاتەوە (دەخاتە کار یان Play دەکات) دوای تەواوبوونی بەرهەمهێنانی.

Perform SmartRender: لە هەندێ حاڵەتدا ئەکرێت کاری بەرهەمهێنانەکە خێراتر بکات. بۆ نموونە کاتێك بۆ جاری دووەم هەمان پرۆژە بەرهەم دەهێنیت دوای ئەنجامدانی چەند گۆڕانکارییەك.

Cropping: دایەلۆگ بۆکسێك پیشان ئەدات کە تیایدا ئەتوانیت لە چوارچێوەی کلیپەکەت کەم بکەیتەوە.

دایەلۆگ بۆکسی Cropping:




- Cropping: لەم چوار بۆکسەدا ئەتوانیت چوارچێوەی نوێی ڤیدیۆکە دیاری بکەیت، ئەو ناوچانەی کە ئەکەونە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیە لە ڤیدیۆکە لادەبرێن. بۆ نموونە ئەتوانیت چوارچێوەی خوارەوە کەمێك ببەیتە سەرەوە لە ڤیدیۆیەك کە لە کەناڵێکی هەواڵەوە وەرت گرتبێت کە هەواڵەکان لە خوارەوەی شاشەکەدا پیشان بدات. ئەتوانیت شاشەکەی لای چەپ بەکاربێنیت بۆ دیاریکردنی چوارچێوەکە. ئەتوانت کۆنترۆڵەکانی ژێر شاشەکە بەکاربێنیت بۆ پیشاندانی ڤیدیۆکەت بۆ ئەوەی ئاسانتر بتوانیت چوارچێوەکە دیاری بکەیت.
- Keep original size: دوای لابردنی ئەو ناوچەی ڤیدیۆکە کە دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەکە، ڤیدیۆکە گەورە دەگات بۆ ئەوەی قەبارەی شاشەکە ببێتەوە بە قەبارەی پێشووی. ئەم هەڵبژاردنە ئەکرێت جوانیی ڤیدیۆکەت کەم بکاتەوە.

## تابی General




Data track: دیاری دەکات فایلێك دروست بکرێت کە تەنها ڤیدیۆ بێت یان دەنگیشی لەگەڵدا بێت.

Frame rate: فرەیم ڕەیتی ڤیدیۆکەت دیاری دەکات، واتە ژمارەی فرەیمەکان لە یەك چرکەدا. بۆ ڤیدیۆی PAL بەزۆری 25 بەکاردێت.

Frame type: بۆ کۆمپیوتەر frame-based هەڵبژێرە، بۆ ئامێری دیکە field-based.

Frame size: قەبارەی شاشەی ڤیدیۆکەت دیاری دەکات. بەپێی جۆری فایلەکە ژمارەی قەبارەکان جیاوازە.

Display aspect ratio: لێرەدا ئەتوانیت ڕێژەی درێژی شاشەی ڤیدیۆکە بۆ بەرزییەکەی دیاری بکەیت. بۆ NTSC 16:9 بەکاردێت و بۆ PAL 4:3.

# بەشی حەوتەم



# ڕێگەی کورت بۆ ئەنجامدانی کارەکان بە کیبۆرد.

# Keyboard Shortcuts



Typewriter keys | Function keys | Enter keys
Windows keys | Numeric keypad | Other
Application key | Cursor control keys

## لیستی File

| | |
|---|---|
| Ctrl + N | پرۆژەیەکی نویٚ دروست دەکات. |
| Ctrl + O | دایەلۆگ بۆکسی Open دەکاتەوە. |
| Ctrl + W | پرۆژەکەی ئێستا دادەخات بەبیٚ داخستنی میدیا ستودیۆ. |
| Ctrl + S | پرۆژەکە خەزن دەکات. |
| Alt + Enter | دایەلۆگ بۆکسی Project Settings دەکاتەوە. |
| F6 | دایەلۆگ بۆکسی Preferences دەکاتەوە. |
| Ctrl + Q | میدیا ستودیۆ دادەخات. |

## لیستی Edit

| | |
|---|---|
| Ctrl + Z | پەشیمانبوونەوە لە دوا کردار. |
| Ctrl + Y | دووبارە ئەنجامدانەوەی کردارێك کە لیٚی پەشیمان بووبیتەوە پێشتر. |
| Ctrl + X | ناوچەی دیاریکراو کەت دەکات. |
| Ctrl + C | ناوچەی دیاریکراو کۆپی دەکات. |
| Ctrl + V | بابەتی کەت یان کۆپی کراو دادەنێت. |
| Del | ناوچەی دیاریکراو دەسڕێتەوە. |
| Ctrl + L | هەموو کلیپەکانی ناو Timeline دیاری دەکات. |
| Ctrl + B | هەر ناوچەیەك دیاری کرابێت دیاری کردنەکەی لادەچێت. |
| F7 | کلیپەکە لە پرۆگرامێکی دیکەدا دەکاتەوە. |

## لیستی View

| | |
|---|---|
| + | هێنانە پێشەوە. |
| - | بردنە دواوە. |
| F9 | پیشاندانەکەی ئێستا دەگۆڕێتەوە بە پیشاندانی پێشوو. |

## لیستی Search

| | |
|---|---|
| Ctrl + G | دایەلۆگ بۆکسی Go To دەکاتەوە. |
| Ctrl + F | دایەلۆگ بۆکسی Find Clip دەکاتەوە. |
| F2 | دوا گەڕان دووبارە ئەنجام دەدات. |

## لیستی Clip

| | |
|---|---|
| Ctrl + D | دایەلۆگ بۆکسی Video Filters دەکاتەوە. |
| Ctrl + A | دایەلۆگ بۆکسی Audio Filters دەکاتەوە. |
| Ctrl + R | دایەلۆگ بۆکسی Overlay Options دەکاتەوە. |
| Ctrl + M | دایەلۆگ بۆکسی Moving Path Options دەکاتەوە. |
| Ctrl + I | ڤیدیۆ لە دەنگەکەی جیا دەکاتەوە. |